بسم الله الرحمن الرحيم

وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ

(آل عمران: ١٠٣)

إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ

(الانعام: ١٥٩)

ترجم الكتاب عن النسخة العربية الطبعة الرابعة لعام ١٤١٣ هـ /١٩٩٢م الى الكردية.

عدد النسخ المطبوعة: ١٥٠٠ نسخة.

---

ئەم پەرتووكە لە چاپی چوارەمی نوسخە عەرەبیەكەوە سالّی ١٤١٣ك/١٩٩٢ز وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی كوردی.

تیراژ: ١٥٠٠ دانە.

أشرف على الترجمة:

د. صلاح عزيز و المهندس سركوت إبراهيم

الطبع والنشر: مكتب التفسير /أربيل

مطبعة خبات دهوك/ كردستان العراق ١٩٩٩م

---

سەرپەرشتی وەرگێڕانی نوسخە كوردیەكە:

د. سەلاح عەزیز و ئەندازیار سەركەوت ئیبراهیم

چاپكردن وبلاوكردنەوەی : نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر

چاپخانەی خەبات دهۆك / كوردستانی عێراق

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد خاتم النبيين وعلى آله وصحبه ومن دعا بدعوته واهتدى بهديه الى يوم الدين، وبعد:

نەخۆشیەکانی ئوممەتی ئیسلامی -لەسەردەمی ئێستاماندا- زۆربووە و پەلی هاویشتووە و بڵاوەی کردوە تاوەکو زۆر لایەنی کاروباری دین و دونیای گرتۆتەوە، ئەوەی جێی سەرسوڕمان و غەریبە کە ئەو ئوممەتە بەردەوامە لە ژیاندا. ئەو دەرد و نەخۆشیانە -سوپاس بۆ خودا- دەگەڵ زۆری و مەترسیشیان شوێنی کوشندەیان نەپێکاوە، ئەگەرچی هەندێك لەو نەخۆشیانە زامنی لە نێوبردنی نەتەوە و گەلان دەکەن، بێ ئەوەی ژمارەیان و زۆری داهاتیان بە هاواریان بێن. بێگومان هۆی سەرەکی رزگاری ئەو ئوممەتە تاکو ئەمڕۆ -دەگەڵ بێهێزی و داتەپیویشیدا- بوونی کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەر و ﷺ تۆبە و داوای پیاوچاکانیەتی.

﴿وَمَا كَانَ اللهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ، وَمَا كَانَ اللهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ الأنفال: ٣٣.

بێگومان ترسناکترین نەخۆشی کە دووچاری ئوممەتی ئیسلامی بوبێ دەردی ئیختیلاف یان موخالفە بووە. ئەو نەخۆشی‌یە کاریگەرە گشتگیرەی کە هەموو بوار و کەنار و کۆمەڵگەیەکی گرتۆتەوە. بازنەی شومی بەدبەختی ئەو دەردە، فیکر و عەقیدە و بۆچوون و را و زەوق و رەفتار و ئاکار و رەوشت و ڕێڕەوی ژیان و چۆنیەتی مامەڵە و شێوازی ئاخاوتن و ئاوات و ئامانج و مەبەستە دوور و نزیکەکانی، گرتۆتەخۆ. تا ئەوەی تارمایی رەشی بەسەر دەروونی خەڵکیدا کێشاوە. ئاسمانی دڵەکان بە تەمی ئەندێشە لێل بوون و بارانی نەزۆکیان بەسەر دڵە مردووەکاندا باراند. کە بووە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵە خەڵکێکی ململانێکاری پیلان گێر. وەك ئەوەی هەرچی ئەو ئوممەتە لایەتی لە فەرمان و نەهی و رێساکانی، هانی

دەدا بۆ ئیختیلاف و مەیلی پیلان گێڕی و بەگژیەك داچوون!! شتەكەش بە تەواوی پێچەوانەی ئەوەیە، ئەوەتا كتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەسەر هیچ شتێك ئەوەندە پێداگرنینە -لەپاش یەكتا پەرستی- ئەوەندەی تەئكید دەكەن لەسەر یەكگرتنی ئوممەت و وەلانانی ئیختیلاف لە نێوان رۆڵەكانی و چارەسەری هەر شتێك كە بۆی هەیە پاكی پەیوەندی نێوان موسوڵمانان لێڵ بكا، یان درز بخاتە برایەتیان. بنەماكانی ئیسلام -پاش هاوبەش بۆخودا دانان- ئەوەندە دژی هیچ شتێك نییە، وەك دژی ئیختیلاف و بەربەرەكانی نێو ئوممەتە. ئەوەندە هانی نەداوە بۆ شتێك -بێجگە لە باوڕ بەخودا- وەك هانی یەك ریزی و هۆگری نێوان موسوڵمانانی داوە. فەرمانەكانی خودا و پێغەمبەر ﷺ، لە بانگەشەیان بۆ یەك ریزی و هۆگری دڵەكان و لێك بەستنی كۆششەكان و پشتگیری هەوڵی یەكتر، روون و ئاشكران.

ئیسلام ئەوەندە تەئكیدی لەسەر هیچ شتێك نەكردوە وەك تەئكیدی لەسەر (وشەی یەكتاپەرستی) و (یەكدەنگی) كردووە. یەكەمیان بانگەشەی باوڕهێنان بەخودا دەكا، باوڕێكی پاك و بێ خلتە و دووەمیان بەكردەوە رەنگدانەوەی تەواو بۆ یەكەمیان. جا ئەوانەی یەك خودا و یەك پێغەمبەر و یەك كتێبیان هەبێ و رووگەیان یەك بێ و هۆی دروست بوون و رزقیان یەك بێ، هەر دەبێ و پێویستە گوفتاریشیان یەك بێ.

﴿إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ الأنبياء: ٩٢

بەلام -بەداخەوە- موسوڵمانان سنووری وشەی یەكتاپەرستییان بەزاند و یەكدەنگییان بەكەم داناوە.

لەو روانگەیەوە ئەو كتێبە دەیەوێ بەشداری بكا بۆ دەستەبەركردنی هۆشیاری و هەوڵێكی راستگۆیانە بۆ پڕكردنەوەی درز و چارەسەری رەگی ناكۆكی و

بوژاندنەوەی رەهەندی ئیمانی لەدەروونی موسوڵماناندا دوای ئەوەی کە دەهات لە حوکمی پەیوەندیەکانمان و رینمایی بەرەو ئاراستەی راستەقینەدا ون ببی. بە هۆی تیگەیشتنی لار و پیادەکردنی هەڵە و لە ژێر گوشاری کۆمەڵگە نائیسلامیەکاندا. بۆیە ئامادەیی رەهەندی ئیمانی و گەیشتن بە تێگەیشتنێکی تەواو زەمانەتی حەقیقی یە بۆ شەرعیەت دان بە پەیوەندی یەکانمان و دوا پەناگەیە بۆ نەهێشتنی ناکۆکی و لابردنی رك و کینەی دڵەکانمان. ئەو چەڵەمەی ئەمرۆ پێوەی گرفتارین. ئەوە لاوازی تێگەیشتنمانە لە مەرامی ئەوەی دەیزانین و کەمی هەست کردنمانە بە مەبەست و ئامانجەکانی. هەروەك ئاراستەکاری راست و ئامۆژگاری پێویستمان لە دەستداوە، کە سەلامەتیمان پێدەبەخشی و دەستکەوتی راستمان وەدەست دەخات لەسوود بینین لەو زانست و زانیاریانە.

ئێمە زانیاریمان وەدەست هێنا و رەوشت و ریزیمان لەدەست چوو. بووینە خاوەنی ئامراز، ئامانج و مەبەستمان ون کرد. ئای کە خیلافمان لەسەر سوننەت و موباح زۆرکاری فەرز یان واجب یان ئامانجی گەورەی لەدەست داین. هونەری بەربەرەکانی و بەڵگەسازی و خیلاف چاك فێربووین، بەڵام ئاداب و رەوشتیمان لەدەستدا، تا ئەوەی بووینە نێچیرێکی ئاسان بۆ داخورانی نێو خۆ و ململانی و خۆ خۆری کە بە گوزەرانێکی تاڵ و سەخت و ژیانێکی دۆراوی گەیاندین.

تا حاڵمان بەوە گەیشت بەزین و بوینە پوشی بەر با هەروەك خودای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ الانفال: ٤٦.

خودای گەورە مێژووی خاوەن دینەکانی پێشووی بۆ ئاگاداری و پەند وەرگرتن بۆ گێراوینەتەوە، چۆنیەتی هەڵسانەوەی ئوممەتەکان و بنیادنانی شارستانیەتەکانی بۆ باسکردووین، هۆیەکانی هەرەس و داروخانی دیارکردوە و ئاگاداری کردوینەوە نەکەوینە نێو پەتای پەرتەوازەیی و دەردی خیلاف و هەڵدێری حزبایەتی تەسك.

﴿ وَلاَ تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً، كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾ الروم: ٣٢،٣١ ئەو خیلافەی دەبێتە هۆی لێك جیایی و پەرتەوازەیی بەوە داناوە کە دوورە لە ڕێگەی پێغەمبەرێتی و بێبەرییە لە چوونەوە سەر ڕێگەی پێغەمبەر ﷺ ﴿ إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ﴾ الأنعام: ١٥٩.

چونکە خاوەن کتێبەکان لەبەر کەمی زانست و زانیاری تیانەچوون، بەڵکو تیاچوونیان لەبەر ئەوە بوو کە ئەو زانست و زانیارییەیان بۆ ستەمی نێو خۆیان بەکار دەهێنا ﴿ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلاَّ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْياً بَيْنَهُمْ ﴾ آل عمران: ١٩.

ئایا ئێمە میراتگری دەرد و بەڵای خاوەن کتێبەکان بووین لە جیاتی ئەوەی میراتگری کتێبەکان بین؟

ئایا میراتگری ستەم بووین لە جیاتی میراتگری زانست و زانیاری و پابەندی خۆرەوشتیان بین؟

ئیختیلاف و ستەم و هەڵاواردن (تفریق)ی دین بەڵای خاوەن کتێبەکان بوون کە بووە هۆی لە نێوچونیان و سڕانەوەی دینەکەیان، مانەوەی سەرگوزشتەیان هۆی ڕوونکردنەوەی پەند و عیبرەتن بۆ ئەوانەی میراتگری کتێب و پێغەمبەرایەتی بوون، بۆیە هیچ ڕێگەیەك بۆگۆڕینەوە و سڕینەوە لە دینی موسوڵماناندا نییە. ئەوان خاوەنی دوایین پەیامن.

ئەو نەخۆشیانەش بە یەکجاری بەسەر جەستەی دا زاڵ نابن یان ئەوەتا بەردەوام دەبێ و ئوممەت لەو بارە بێ هێزەدا دەمێنێتەوە، یان چارەسەر دەکری و

راست دەبێتەوە و دەگاتە ساغی و شادی و دێتەوە سەر پێ و داخورانی نێوخۆش رادەوەستێت، ئەوەش لە تایبەتمەندییەکانی دوایین پەیامە.

ئیختیلاف لە دید و بۆچوون و مەزەندەی شتەکان و حوکمدان لەسەریان کارێکی فطری سروشتییە، تائاستێکی زۆر پەیوەندی بە جیاوازی تاکەکانەوە هەیە، چونکە بیناکردنی ژیان و دامەزراندنی تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان خەڵکانی خاوەن توانای یەکسان و ڕێژەوی چوون یەك،مەحاڵە. ئەگەرنا -لەو کاتەدا- بواری کارلێك کردن و دانوستان نامێنێ ! چونکە سروشتی کارەکانی زیهنی و کردەییەکان پێویستیان بە لێهاتوویی و توانایی جیاواز و لێك جیا هەیە. وەك ئەوەی کە حیکمەتی خودای گەورە پێویستی کردبێ لە نێوان خەڵکان بە جیاوازی تاکەکانییەوە -چ واخەلق کرابێ یان وەدەست هێنرابێ- و لە نێوان کارەکان لە ژیاندا، بنەما و بەیەك گەیشتن هەبێ، هەموویان بۆ ئەوە گونجاون کە بۆی خولقێنراون. جا لەسەر ئەمەوە خەڵکان جیاوازن و بروادارانیش پلە پلەیان هەیە، تیایاندایە ستەمکارە بۆ نەفسی خۆی و تیایاندایە مامناوەندییە و تیایاندایە لە چاکە دەستپێشخەرە ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ هود: ١١٨.

جێگەی داخ ئەوەیە کە گۆڕانی ئیختیلافی دید و بۆچوون لە دیاردەیەکی دروستی کە عەقڵی موسوڵمان دەوڵەمەند دەکات بە رای بە فەر و قوڵ روانین و شارەزایی فراوان لەسەر راو دیدگای جۆراوجۆر و گۆشە نیگای جیاجیا و وردبینی و وردکاری و شۆڕبوونەوە بە داوەڵی فیکر، لەو هەموو لایەنە ئیجابیانەوە، لە لای موسوڵمانانی چەرخی دواکەوتوو بگۆڕێ بۆ نەخۆشییەکی سەخت و ژەهرێکی کوشندە کە بۆتە هۆی داخوران و پارچە بوون و لێك هەڵوەشان و پشت هەڵکردن و بەگژ یەکدا چوون، تاکو ئەوەی لای هەندێك کەسی پاشکەوتوو کار گەیشتۆتە رادەی

لەناو بردنی یەکتری. (بە پێوەرێکی خەفەتهێن) زیادە ڕۆیی هەندێکی‌تر لەوانە تا ئەوەی وا دەبینی دوژمنانی دین و ئەهلی کتێب نزیکترە لێی لەو برا موسولمانەی کە دەگەڵیدایە لە بنەماکانی عەقیدە و بێ گەردی یەکتاپەرستی یەك دەگرنەوە. هەر تەنیا ئەگەر را و بۆچوونیان لەو جودابێ! بۆ ئەمەش لە مێـژووی نزیـك و دووردا شاهیدیمان زۆرە کە جێگەی خەم و خەفەتە ئەو هێزە لەبن نەهاتووەی ئوممەت بەهەدەر ڕۆیی‌و بووە دەستەچیلەی ئاگری فیتنە و ئیختیلاف کە لە هیچی زیاد نەکرد تەنیا شەرمەزاری و گرخۆشکردن نەبێ -پەنا بەخودا-. زۆر جار مرۆڤ دەستە وەستان دەبێ لە ڕوانینێکی هەمە لایەنە و یەکسانی کارەکان و دیدگای سەرتاسەری هاوسەنگ بۆ هەموو مەودا جیاجیاکانی مەسەلەکان. زیهنی تەسك هەڵدێ لەسەر بەشێکی بچووك‌و گەورە و زلی دەکات و لەدوای ماند و دەبێ و هەڵیدەناوسێنێ تاکو تێیدا نقوم دەبێ و دەخنکێ.

کرۆکی فیکرەکەی تا ئاستێك دەگرێ ناتوانێ هیچ شتێکی‌تری دەگەڵ ببینێ یان هیچ کەسێ بەهەڵەی بزانێ. بەو پێوانەیە شت جیا دەکاتەوە و دۆستایەتی و خۆشەویستی و ڕقی لەسەر ئەو دەبێ، جار هەیە یارمەتخوازی لە دوژمنانی دین دەکات و خۆی بەوان بەهێز دەکا تا بەسەر هاودینی ڕاجیاوازی زاڵبێ.

[دەگێڕنەوە واصلی کوڕی عطاء دەگەڵ چەند هاوڕێیەکی توشی کۆمەڵی (خەوارج) هاتن. واصل بە هاوڕێکانی گوت: ئەوە کاری ئێوە نی‌یە بێ دەنگ بن و بۆ منیان لێگەڕێن. زۆر نەما بوو تێدابچن.

گوتیان: باکاری تۆ بێ. واصل چووە پێشیان خەوارج گوتیان: ئێوە کێن؟ واصل گوتی: موشریکین هاتوینە پەناتان بۆ گوێگرتن لە کەلامی خودا و فێربوونی سنووری شەرع. گوتیان: پەنامان دان.

واصل گوتی: فیرمان بکەن. دەستیان بە فیرکردنی ئەحکامەکانی کرد. تا ئەوەی گوتی: ئەوا رازی بووین من و ئەوانەی دەگەلمدان. گوتیان: بڕۆن ئێوە هاوڕێ و برای ئێمەن. واصل گوتی ئەوە بۆ ئێوە نابی. خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾ التوبة: ٦.

بمانگەیەننە شوێنی ئەمینی خومان. هەندێکیان سەیری یەکتریان کرد پاشان گوتیان: ئەوەتان بۆ هەیە. هەموویان وەرێکەوتن تاکو گەیشتنە شوێنی ئەمین (الكامل في اللغة والادب للمبرد: ٢/١٢٢).

توندی ئیختیلاف گەیشتوتە ئاستێك لای هەندێك کومەلی ئیسلامی کە خوی بە تەواو هەق دەبینێ، موشرك دەگەڵیدا زیاتر لەخوی ئەمینترە، لە موسولمانی ناکوك لە دیدوبۆچوون و ئیجتهاد لەمەسەلەی لاوەکی بچووك. بە شێوەیەك موسولمانەکە هیچ ڕێگایەکی نامێنێ خوی پی لە ئازار و ئەشکەنجەی رزگارکا تەنیا بەدەرخستنی سیفەتی هاوبەش دانان (شرك) نەبێ!! .

ئەوە ئیختیلافێکی گێژانەیە، و ئارەزووی زاڵە گەشە دەکاو گەورە دەبێ و برینی قوڵ دەخاتە دل و بەسەر مروڤدا زاڵ دەبێ و پانتایی عەقڵ و هەستی داگیر دەکات، تاکو کومەبەست و بنەما گشتییەکان و مەیدانی هاوبەش و ئامانج و مەبەست و ریسا رەسەنەکانی ئیسلامی لە بیر دەچێتەوە. خاوەنەکەی لە وردبینی و ڕوٚشنایی بی بەش دەکا و ئەبجەدییاتی رەوشتی ئیسلامی لە بیر دەکات، هاوسەنگی تێك دەچی و نیگای لیل و کاری تێکەل و ئەولەویاتی ون دەبی. گوفتاری بێ زانست و فەتوای بی زانین و رەفتاری بی بەڵگە ئاسان دەبی، بە فاسق کردن و کافردانان و تومەت هەڵبەستن بلاودەبێتەوە.

ئیدی بابای نەخوش دەکەویتە دوزەخی دەمارگیری کویرانەی سەخت، دونیا و دەوروبەری تاریك دادی لە تارمایی و تاریکایی ئەنگوستەچاو زیاتر هیچ نابینی. ئەوەشیان لە راستیدا تەنیا رەنگدانەوەی نەفسیەتی تاریکی خویەتی کە روناکی زانستی تیدا کوژاوەتەوە و بلیسەی عەقلی تیدا خاموش بووە.

﴿ و من لم يجعل الله له نورا فما له من نور ﴾ النور: ٤٠.

زورجار بوچوونە ئیجتهادیەکان و قوتابخانە فیقهیەکان، کە مەیدانی کەسانی وردبین و موجتەهیدن، لەسەر دەستی لاساکارە عەوامەکان و دواکەوتووی رەشوکیەبو بواری فیکری حزبایەتی و دەمارگیری سیاسی دەگوردری، تەئویلی ئایەت و فەرمودە بە گویرەی پەیرەوی حزب دەکری و رەنگ ریژ دەکری تا وای لیدی هەر ئایەتیك یان فەرمودەیەك دەگەل ئەو رەنگە فیکرەی حزبایەتی نەگونجی ئەوا یان تەئویل کراوە یان سراوەتەوە، تا ئەوەی دەمارگیری ئەوەندە بەهیزدەبی، ئەو پەندەی سەردەمی جاهیلی وەبیر دینیتەوە:

(كذاب ربيعة أفضل من صادق مضر)

(دروزنی رەبیعە چاکترە لە راستگوی مضر)

پیشینە چاکەکان خودا لییان رازی بی ئیختیلافیان هەبووە، بەلام ئیختیلافیان لە بوچووندا نەبوتە هوی جیابونەوەیان لەیەکتر. ناکوك بوون بەلام لیك دابراو نەبوون. چونکە یەکیتی دلەکان و مەبەست و ئامانجەکانیان لەوە گەورەتر بووە هیچ شتیکی بەسەر بیت. ئەوان لە نەخوشی دەروونی رزگار بووبوون ئەگەرچی هەندیکیان تووشی هەلەی ئەندامی بوون.

ئەو پیاوەی کە پیغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە موژدەی دا بەهاوەلەکانی ئەو کاتەی لییان وەدەرکەوت و فەرمووی: (ئەوە لە ئەهلی بەهەشتە) کە لە کاروباریان کولیەوە دەرکەوت،ئەو ناچیتە چاوی ئەگەر رق و قینی موسولمانیکی دەدلدا بی...

بەلام ئەمرۆ ئیمە كارەسات دەدل و دەروونمان دایە، هەر بۆیە زۆربەی دیاردەی یەككگرتن و بانگێشە بۆی و سەرخستنی بریتییە لە هەلخەلەتاندنی دەروون و نیشاندانی روالەتی دەرەوە،كە تێیدا زۆر جیاوازیمان دەگەل غەیری خۆماندا نییە. خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَذَرُوا ظَاهِرَ الإِثْمِ وَبَاطِنَهُ ﴾ الأنعام: ١٢٠.

جیهانی ئیسلامی پاش ئەوەی تاكە دەولەتێكی پابەندی شەرعی بالای كتێبی خودای گەورە و سووننەتی پێغەمبەر بوو. ئەمرۆ بۆتە هەشتا و حەوت دەولەتۆكە یان زیاتر، هەر خودا دەزانی مەودای ئیختیلافی نێوانیان چەندە، هەمووشیان دروشمی یەككگرتن بەرزدەكەنەوە، بەلكو لە نێو دەولەتێكدا چەندین قەوارە هەیە.

وەنەبێ ئەمرۆ واقعی هەندێك تێكۆشەرانی ئیسلامی - ئەوانەی ئەركی رزگاركردنیان گرتۆتە كۆل - باشتربێ لە دامەزراوە رەسمییەكانیان. قەیرانی ئێمە قەیرانی فیكرە. چەلەمەمان لە جدیەتی خودانەپال (الانتماء) دایە. ئوممەتی ئیسلامی ئەو كاتەی كە بەهەموو فیكرەكانییەوە تەسلیم بوو،كە مەشروعیەتی بالای سەرەكی لە ژیانیدا بداتە كتێب و سووننەت و توانی پەیام هەلگرێ. ئەوە سەرباری ژیان تالی و سەختی باری ماددی، شارستانی بنیاد دەنێ. لەدوای تەنگانە، شادانە.

لاری لە قورئان و سووننەت بەرە و بەربەرەكانێ و بەزین سەردەكێشێ. خودای گەورە دەفەرمویێ:

﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ﴾ الأنفال: ٤٦.

ئیسلام پارچە پارچەیی و داخورانی نێو خۆی راگرت و رووی عەرەبەكانی بەرە و خودایەكی تەنیای هەق وەرگێرا، خودا ساختەكانی وەلانا،كە هەر هۆزێك پەرستراوێكی هەبوو رووی تێدەكرد.

بەلام ئەمرۆ موسولمانان گلەییان لە كەمی ماددە و سەختی ژیان و كەمی داهات نییە، دەگەل ئەوەشدا سەردەستەی نەتەوە لەكاركەوتووەكانن چ لەسەر

ئاستی فیکری یان لەسەر ئاستی پێداویستی‌یە ژیەنەرەکان. هەقیقەتی دەردیش لە لەدەستدانی کۆمەبەستەکان و پشکە هاوبەشەکان و یەکێتی ئامانج خۆی دەنوێنی. مەشروعیەتی گەورەیان لە ژیاندا لەدەستداوە و نارێکی کەوتوتە نیاز و هاوبەندی فیکریان.بۆ ئەوەش هیچ ڕێگەی دەرچوون لەو ئاڵۆزی فیکری‌یەی تووشی عەقلی موسولمانان بووە و لەو قەیرانە ئەخلاقیەی کە ئاکاری موسوڵمانانی تێوە گلاوە. نی‌یە. تەنیا بە چارەسەرکردنی رەگ و ریشەی ئەو قەیرانە فیکری‌یە و چارەسازی مەنهەجی بیرکردنەوە نەبێت.

دەبێ دوبارە دارشتنەوەیەکی فیکری بۆ عەقڵەکان و دوبارە رێکخستنی لە دەستچوو بۆ ئەولەویاتەکان بکرێتەوە و نەوەی موسوڵمانی لەسەر پەروەردە بکرێتەوە، هیچ رێگەیەکیش بۆ ئەوە نی‌یە تەنیا بە گەڕانەوە نەبێ بۆ ئەو شتەی کە پێشینەکانمان لە قۆناغی یەکەم لەسەری بوون. لە دەستگرتن بە بەرنامەی پەروەردگاریان و سوننەتی پێغەمبەریان ﷺ. دانانی چەند مەرج و رێسایەك بۆ پێك گرتن و هەڵێنجان بۆ کۆنترۆڵکردنی راو بۆچوون و زامنی ڕێرەوی فیکر و پێکەوە بەستنی زانست بە رەوشتی‌یەوە و زانیاری بە ئادابی‌یەوە. هەروەك دەبێ گەشە بەو لێکۆڵینەوانە بدرێ کە تەئکید لەسەر یەکێتی ئوممەت و لایەنە هاوبەشەکانی و مەبەست و ئامانجە بەرزەکانی دەکەن، بە کۆکردنەوەی ریز و ریکخستنی بەرەکان، مەشخەڵی رێگا روون دەبێتەوە و هەنگاوەکانی رێرەو رێك دەخرێن -بە پشتیوانی خودا-.

ئەو کتێبە بۆ ئەو مەبەستە نوسراوە و هەوڵێکی سەرەتایی بچووکە و هەنگاوێکە بۆ گەڕانەوە سەر رێ. بە پشتیوانی خودا.

لە کاتێکدا چاپی ئەو کتێبە پێشکەش بە خوێنەری بەرێز دەکەم، بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ گرنگترین کاردانەوەی بکەم، لە میانەی ئەوەی راستەوخۆ پێم

گەیشتووە لە نامەی خوێنەران و قسەکانیان.هەندێکی‌تر کە لە بڵاوکراوەکاندا لەسەر ئەو کتێبە نووسراوە یان لە کۆڕو کۆبونەوەکاندا گوتراوە:

١. جەماوەرێکی فراوان بە پیر ئەو کتێبەوە هاتوون و پێشوازی چاکیان لێکردووە، زۆر لە موسولمانانی غەیری عەرەبیش لەسەر وەرگێرانی بۆ زمانەکەیان و چاپکردنی مکوربوون. ئیجازە بۆ هەموو ئەوانەش هەیە کە دەیانەوێ بۆ سەر زمانی دیکەی وەریگێڕن.تا ئێستاش بۆ سێ زمان وەرگێردراوە.

٢. دەستەیەکی بەهۆشی ئاگادار بە ترسناکی کارەساتەئاواتیان بوو کە زیاتر باسی واقیعی ئیسلامی کرابوایە و ناکۆکی و دووبەرەکی سەردەمی شیبکردایەوە، کە تاکە بزووتنەوەیەکی ئیسلامی لە وڵاتێکی ئیسلامی کردۆتە ئەوەدوسێ بزوتنەوەی سەربەخۆ لە یەکتر. لەبەر ئەوەی شوورەی بێ‌ئاگایی و بێ هێزی یادکردنەوە و تەمومژی مەبەستی جیاجیای چڕوپڕ تا ئاستێکە،وتەی ئارامبەخش ناتوانێ تێپەڕکا و بگاتە دڵە ماندوەکان.

هەرچەندە زۆر گەشبینم کە مەیل و ئارەزووی ئیسلامیەکان،بە تێك گەیشتن و رێك کەوتن و رزگار بوون لە شوێنەواری ئیختیلاف،ئیسلامیەکان بەو ئاستە بگەیەنێ. بەڵام هەردەم لە نەزانی نەفامان و فرت و فێڵی رق لەدڵان و ئاژاوەی کەللە رەقان و پیلانی پیلانگێران دەترسم.

گۆرەپانی ئیسلامی بۆ وەکارخستنی ئەو رێ و رەوشانە لە واقیعدا و -بە راشکاوی و ئاشکرایی- دەربڕینی ئەوەی بۆ هەر دەستەیەکی ئیسلامی سەردەم چی هەیە و چی لەسەرە -بەمەزندەم- تا ئێستا نەرمخساوە. بەڵام پڕ چەك کردنی گەنجی موسوڵمان بەو دیدگا روونە و فێر بوونی هەر یەکێکیان

بەو ڕێ و ڕەوشانە و بڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە زانیاریانە لە نێویان انشاء الله.گەرمەنتی ڕەخسانی ئەو گۆڕەپانە بۆ ئەو هەنگاوە دەکا.

٣. دەستەیەکیتری دڵسۆز ئاواتیان بوو کە ئەو کتێبە گەورەتر بوایە و نموونەی زیاتری گرتباخۆ، نموونەی لەسەر ئادابی ئیختیلاف لە مەزهەبەکانیتری ئیسلامی وەرگرتبا.

ئەوەش هەقە، خۆزگە دەخوازین لە چاپی داهاتوو دا بۆ ئەو کارە سەرکەتوو بین.

لەوەی خستومانەتە ڕوو نەمانویستوە هەمە لایەنە و گشتگیربێ، بەڵکو ویستومانە چەند نموونەیەکی کەم لەو ئادابانە بخەینە ڕوو بۆ وریا بونەوە لە هیتر و ئاماژەش بۆ هاوشێوەیان.

٤. دەستەیەکیتری دڵسۆز پێشنیاریان کرد، ئەگەر ئەو کتێبە لە مۆرکی فیقهی و ئەکادیمی دەرچوویایە و گشت جۆرەکانی ئادابی ئیختیلافی نێوان هەموو بەشەکانی ئوممەتی خستبایە ڕوو چ ئەوەی لە ڕیزی ئیسلامیدان یان ئەوانەی دەدرێنە پاڵ ئیسلام یان بە ڕەهایی دەگەڵ فیکرەی نوێخوازی و نوێبونەوەدان. بە تایبەتی ئەو گروپانەی جاری جەنگیان بەسەر ئیسلامدا نەداوە و ئیسلام بە یەکێك لە کۆڵەگەکانی بنەڕەتی ئوممەت دادەنێن، هەموو ئەوەی کە بانگێشەی بۆ دەکەن ئەوەیە کە ئوممەت بگەیەننە ئەو سەردەمەی تێیدا دەژی و هاوشانی پێشکەوتنی شارستانی بێ لە چوارچێوەی قەومیدا، گومان دەبەن کە ئەو چوار چێوەیە فراوانە بۆ ئیسلام و غەیری ئەویش لە کۆڵەگەکانی بنەڕەتی ئوممەت.

لە ڕاستیدا پێم وایە ئەوە هەقە و کۆشش لەو بوارەدا دەبێ هەر بکرێ، چونکە زانینی ئادابی ئیختیلاف و هۆشیاری تەواوی توێژەکانی ئوممەت بە ڕێساکانی

و پەروەردەكردنی رۆلەكانی لەسەر رەچاوكردنی. ئەوا زۆر لەو وزە لەناوچو و بە فیرۆچوانەی گورەپانی ململانێی نێوخۆ گـل دەداتـەوە. عەقلیـەتی موسولمان كاتێك هەستی بە رۆلی ژیاری خۆی كرد، هەول دەدا بۆ گێرانـەوەی رۆلـە ئاوارەكـانی ئوممەتەكـەی. ئیسـلامیەكانیش بەرپرسـن لـە بنیادنـانی بناغەیـەكی دروسـت بـۆ گێرانـەوەی ئوممـەت بـۆ یـەكگرتوویی و كامـەرانی و پتەوكردنی ستونەكانی فیكری ژیاری، پاشان بنیادنانی شارستانیەت لەسەر زەوی. ئەوەی مردن و ژیان لێك جیا دەكاتەوە، هەناسەیەكە، جا ئەگەر بەراستی عەزیمەتمان كرد ئەوە شتێك نی‌یە بەربەست بێ لە نێوان ئێمە و گێرانـەوەی رۆلەكانمان كە شەیتان لەخشتەی بردوون. ئەو كاتەش بڕواداران بەسەركەوتنی خودا شاد دەبن و زەرەرمەندیش ئەوانەن كە ناهەقن.

- پیریكی زۆر كەم - وەك بزانم - نارەزاییان لە دەركردنی ئەم جۆرە كتیبانـە دەربڕی و گوتیان: نابێ موسولمانان ئیختیلافیان هەبێ. لە كـاتی ڕوودانـی ئیختیلاف لە نێوانیاندا تركیز لەسەر دەربڕینی حەرامی ئیختیلاف بكرێ‌ڕوا دابنرێ كە كوفرە و واجبە بە هەموو تواناییەك لە نێو ببردرێ. بەلام كە باسی ئادابەكەی دەكەین ئەوە مانای بە ئەسل دانانی ناكۆكی و دان پێدانانیەتی.

لەو كاتەدا نازانم چ بەو كەسانە بڵێم: تەنیا ئەوە نەبێ كە سەرسامم لەوەی بێ ئاگایی مرۆڤ بگەیەنێتە ئەو ئاستەی نكولی لە حەقیقـەت بكا یـان لـە بـیری بەرێتەوە. لێرەدا هەستم بە ئازارەكانی ئەمیری بڕواداران (عەلی) كرد ﷺ كە فەرمویە: (هـەر زانایـەك گفتوگـۆی دەگـەڵ كـردوم بەزاندومـە، هـەر نـەزانێك گفتوگۆی دەگەڵ كردوم بەزاندومی).

بەلام بەهەر حاڵ لە خودای بالا دەست داواكارم ئێمە و ئەو گروپە بێنێتە سەر ڕێگەی هەق و ڕاستی.

له کۆتاییدا:

پەیمانگەی جیهانی فیکری ئیسلامی ڕێی ئاسان کرد کە ئەو کتێبە بە چاپێکی نوێوە لە میانەی زنجیرەی (ئیسلامییەتی ڕۆشنبیریی - اسلامية الثقافة) پێشکەش بکرێ، تا پێویستی‌یەك دابین بکا و بۆشایی‌یەك پڕبکاتەوە. خۆزگە مامۆستا بەڕێزەکان، کە لوتفیان کرد بە هەندێك لەو پێشنیارانەی ئاماژەمان بۆیان کرد، بە هانا بین بۆ بەشداری کردن لە بە ئاکام گەیاندنی هەنگاوەکانی ئەو کتێبەو تەواو کردنی ئەوەی دەستی نووسەرەکە پێی نەگەیشتووە، بۆ دانانی ڕێسای حیوار و بەهێزکردنی ستونەکانی ئەدەبی ئیختیلاف لەسەر بناغەیەکی بەتین و زەمینەیەکی لەبار. خوداش نیشاندەری ڕێگەی ڕاستی‌یە

شعبان/١٤٠٧

فبراير/ ١٩٨٧

# ئیختیلاف و خیلاف و زانستی خیلاف

ئیختیلاف و موخالەفە ئەوەیە کە کەسێك ڕێگەیەکی جیاواز لە کەسێکی‌تر بۆ کاروباری یان بۆ گوتاری بگرێتە بەر. خیلافیش لە وشەی (دژ) فراوانترە، چونکە هەموو دژێك لێك جودان، کەچی هەموو لێك جوداکان دژنین. جا کە ئیختیلافی نێوان خەڵکان لە گوتاردا سەر بکێشێ بۆ ناکۆکی، ئەوەش بۆ بەربەرەکانی و دەمەقاڵێ خوازراوەتەوە. خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِنْ بَيْنِهِمْ...﴾ مريم: ٣٧.

﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ هود: ١١٨.

﴿إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُخْتَلِفٍ﴾ الذريات: ٨.

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ يونس: ٩٣.

لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین مەبەست لە (خیلاف و ئیختیلاف) جیاوازی موتلەقە لە گوتار یان را یان حاڵەت یان شێوە یان هەڵوێست. بەڵام ئەوەی لای خەڵکی پسپۆر بە (زانستی خیلاف) ناسراوە، زانستێکە دەتوانی ئەو شتانەی کە پێشەوایەك لە پێشەواکان هەڵی گۆزاوە بیپارێزی و ئەو شتانەش کە موخالیفیەتی نەیهێڵێ بێ ئەوەی پشت بە بەڵگەیەکی تایبەت ببەستێ، چونکە گەر پشتی بە بەڵگە بەست و پەنای بۆ برد ئەوە دەبێتە موجتەهید و ئوصوڵی، هەق وایە بابای جیاوازکار نەبێتە لێکۆڵەری حاڵەتی بەڵگە فیقهی‌یەکان. بەڵکو ئەوەندەی بەسە کە دەست بە وتەی پێشەواکەی بگرێ لە بەربوونی پێویستیەکانی حوکم (بەگشتی) لای پێشەواکەی هەروەك وا گومان دەبا، ئەوەش لای ئەو بۆ سەلماندنی حوکم بەسە، هەروەك وتەی پێشەواکەی بەڵگە بێ بۆی بۆ پەرچدانەوەی حوکمی موخالیف، وەك ئەوەی پێشەواکەشی بەوە گەیشتوە.

## جەدەل و (زانستی جەدەل)

ئەگەر دژایەتی یەكێك لە موخالیفان یان هەردوكیان توند بوو لەسەر باورەكەیان لە گوتار یان را یان هەلویستێك و هەولی بەرگری كردن و ئیقناع كردن یان ناچار كردنی كەسی‌تری‌دا. ئەو هەوڵدانە پێی دەگوترێ جەدەل.

جەدەل لە زمانەوانی‌دا (گوتوبێژ لە پێناو بەربەرەكانی و زاڵ بوون)ـە، لە (جدلت الحبل) توندكردنی گوریس وەرگیراوە. ئەگەر گوریس بە بادانێكی بەهێز بادرا.هەر یەك لە جەدەلكارەكان هەول دەدا بەرامبەرەكەی تەنگەتاو كا و بەهێز و پتەو بیهێنێتە سەر را و بۆچونی خۆی.

بەلام (زانستی جەدەل): زانستێكە بە رووبەرووكردنەوەی بەلگەكان هەلدەستێ بۆ دۆزینەوەی تاسەنگترین بوچونی فیقهی.[1]

هەندێك لە زانایان وای دەناسێنن كە (زانستێكە دەتوانرێ ئەو شتەی پێ بپارێزرێ كە مەبەستە ئەگەر ناهەقیش بێ. ئەوشتەشی پێ لەناوببرێ كە مەبەستە ئەگەر هەقیش بێ).[2]

لەو پێناسەدا كاریگەری مانای زمانەوانی جەدەل دەردەكەوێ. چونكە -بەم پێیە- زانستێكە پابەندی بەلگەیەكی دیار نییە. بەلكو توانایەكە یان هێزێكە دەدرێتە كەسێك هەرچەندە هیچ ئاگاداری قورئان و سوننەت و شەرع نەبێ.

---

١ بنوره (مفتاح السعادة ٢/٥٩٩) چاپی دار الكتب الحديثة مصر. (التعريفات للجرجاني - ٦٦) چاپی الحلبی.

٢ سەرچاوەی پێشوو

## دووبەرەكی (الشقاق)

ئەگەر دژایەتی جەدەلكاران توند بوو، هەر لایەك مەبەستی زالبوون بوو لە جیاتی رشت بوون لەسەر دەركەوتنی هەق و دەرخستنی راستی، تێگەیشتن یان رێكەوتنی نێوانیان وەزەحمەت كەوت،ئەو حاڵەتە پێی دەگوترێ (دوبەرەكی).

ئەسلی (دوبەرەكی)یش ئەوەیە هەریەكەی لە بەرێكی زەوییەك دابن، واتە نیوەی یان لایەكی زەوی، وەك ئەوەی یەك زەوی بۆیان پێكەوە تەنگ بێ. لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە : ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا ﴾ النساء: ٣٥ واتە ناكوكی توندوتیژ.

هەریەكیان بەدوادابێ، هەریەكەیان وای بكا لایەكی جیا لە لاكەی ئەویتر بگرێ. هەروەك خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ﴾ البقرة: ١٣٧.

## وەرگیراو و رەدكراو لە ئیختیلاف دا

خودای گەورە خەڵكی بەعەقل و هەستی جیاواز دروستكردوە. شان بەشانی جیاوازی زمان و رەنگ وتێروانین و بیروڕا، هەموو ئەو شتانەش دەبنە هۆی فرەیی وفرەحوكمی، جیاوازن بە جیاوازی بیژەرانی. جا ئەگەر جیاوازی زمان و رەنگ و شێوەی دروستبونمان نیشانەیەك بێ لە نیشانەكانی خودای گەورە، ئەوە جیاوازی هەستكردن و عەقڵمان، هەروەها بەرهەمی ئەو هەست و عەقڵەشمان نیشانەیەكیترە لە نیشانەكانی خودای گەورە و بەڵگەیەكە لە بەڵگەكانی توانای بێ كوتایی ئەو. ئاوەدانی گەردون و سەرهەڵدانی بوون و پەیدابوونی ژیان هیچیان دەستەبەر نەدەبوون ئەگەر مروڤەكان لە هەموو شتێك دا وەك یەك دروست كرابوان، هەركەس بۆ ئەوە گونجاوە كە بوی دروست كراوە ﴿ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إِلَّا مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ ﴾ هود: ١١٨،١١٩.

ئەو ئیختیلافەی لە پێشینەی ئەو ئوممەتە ڕوی داوە -کە ئێستاش ڕودەدا- بەشێکە لەو دیاردە سروشتی‌یەی، ئەگەر سنوری نەبەزێنرێ و پابەندی ئادابەکەی بکرێ،ئەوە دیاردەیەکی ئیجابی زۆر بەسوودە.

## هەندێک لە سودەکانی ئیختیلافی وەرگیراو (پەسند)

وەك گوتمان ئەگەر سنووری ئیختیلاف نەبەزێنرێ و خەلکان پابەندی ئادابەکەی بن ئەوە هەندێك ئیجابیاتی هەیە، لەوانە:

أ. ئەگەر نیەتی ڕاست هەبوو - ئەوە هەلێك دەبێ بۆ ناسینی هەموو گریمانێك کە لەوانەیە بەلگە لە لایەك لە لایەنەکانی‌یەوە بوی چوو بێ.

ب. ئیختیلاف- بەو پێناسەی باسمان کرد- وەرزشێکە بۆ هۆش و موتوربەکردنی بیروڕا و کردنەوەی بواری بیرکردنەوە بۆ گەیشتن بە هەموو گریمانەکانی کە عەقلی لێك جیا دەتوانن پێی بگەن.

ج. فرەچارەیی دەخاتە بەردەم کەسی دووچاربوو، ڕزگاربوونی بۆ چارەیەکی گونجاو لەو بارەی تێ‌یدایە، کە دەگەل ئاسانی دینەکە بگونجێ، چونکە بەپێی واقیعی ژیانی خەلك مامەلەیان دەکا.

ئەو سودانەو هی‌تریش لەوانەیە دەستەبەربێ ئەگەر ئیختیلاف لە بازنەی سنورو ئادابی خوی بمێنێتەوە کە ڕشت بوون لەسەری و چاودێری کردنی پێویستە، بەلام ئەگەر سنووری خوی بەزاند و پابەندی ئادابەکانی نەبوون، بۆ جەدەل و دووبەرەکی دەگورێ. ئەوەش دیاردەیەکی سلبی ئاکام خەراپە و درز -زیاد لەوەی هەیە- دەخاتە نێو ئوممەت، ئەوا ئیختیلاف لە دیاردەیەکی بنیادنەر دەبێتە پاچێکی ڕوخێنەر.

# بەشەكانی خیلاف لە روی پاڵنەرەوە

**١. خیلافی ئارەزوو وازی بیّ:**

وا دەبیّ خیلاف ئەنجامی ئارەزوی نەفس بیّ بۆ دەستەبەرکردنی مەبەستێکی زاتی یان کارێکی شەخسی، یان پاڵنەری خیلاف ئارەزوی خۆ رانواندنە بە تیگەیشتن یان زانین یان فیقهـ. ئەو جۆرە خیلافە بە هەموو شێوە و جۆرەکانی‌یەوە بێزراوە، چونکە بەشی هەوا و نەفسی تێدا زاڵترە لە دۆزینەوەی هەق، نەفس و ئارەزووش خێری لیّ پەیدا نابیّ، تەنیا شەیتان بەرە و سەرکێشی دەیکێشیّ، خودای گەورە دەفەرمویّ:

﴿ أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَى أَنْفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقاً كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقاً تَقْتُلُونَ ﴾ البقرة: ٨٧ بە ئارەزووی نەفس دادگەری وەلا دەنرێ، ئەوەی وەلای دەنێ لە ستەمکارانە.

﴿ فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا ﴾ النساء: ١٣٥ بە ئارەزوی نەفس گومرایان لاری و گومرابوون.

﴿ قُلْ لَا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ قَدْ ضَلَلْتُ إِذاً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ﴾ الأنعام: ٥٦.

ئارەزوی نەفس دژی زانست و پێچەوانەیەتی، دوژمنی حەقە و هاوتای فەسادە و رێگەی گومرایی‌یە:

﴿ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ ص: ٢٦.

﴿ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ ﴾ المؤمنون: ٧١.

﴿ وَإِنَّ كَثِيراً لَيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ الأنعام: ١١٩.

جۆرەکانی ئارەزووی نەفس فرەن، سەرچاوەکانی بەربلاون، ئەگەرچی هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ (ئارەزووی نەفس و خۆپەرستی) ئەو ئارەزووەش مەکۆی زۆر لەو هەڵە و کۆمەڵە لاری چوونانەن، مرۆڤ ناکەوێتە نێو توری ئارەزو و تاکو هەموو ئەو شتانەی مایەی لە هەق لادانن بوی نەرازێتەوە و بو ریگەی گومرایی نەینێری، تاکو هەق دەبی بە ناهەق و ناهەقیش بە هەق. پەنا بە خودا.

دەتوانین خیلافی نەتەوە و کۆمەڵە دینی‌یەکان (ملل ونحل)و بیدعەکارانی دینی خودای بەرز بۆ دەردی ئارەزووی نەفس بگێرینەوە .لە نیعمەت و چاودێری خودا بۆ سەر بەندەکانی ئەوەیە، پێش ئەوەی سەرەنگرییی هەڵدێری گومرایی بکات، نیشانی دەدا تا چەند مەزەب و فیکر و بیروڕای پەیوەستە بەئارەزووی نەفسیەوە، بەجۆرێك خودای بەرز مەشخەڵی ئیمانی دەدلدا ڕۆشن دەکا و گەندەڵی ئەو مەزەب و فیکر و بیر و باوڕانەی نیشان دەدا، چونکە چاکییان لە نەفسیدا هیچ بونیکی حەقیقی نی‌یە، بەڵکو بونیکی زیهنی یان خەیالی یان شیوەیی هەیە کە ئارەزوەکەی نەخشەی کێشاوە و لە نەفسی‌دا ڕازاندویەتی‌یەوە. ئەگەرچی لە واقیعدا زۆر دزێوە یان هیچ بونی نی‌یە تەنیا لەمێشکی ئەو کەسە نەبی کە تی‌یەوە گلاوە.

بۆ دۆزینەوەی کاریگەری ئارەزووی نەفس لەسەر هەر فیکرێك، ریگا زۆرە: هەندێکیان دەرەکین، هەندێکیان خودی (زاتی)ین.

أ. ئەو ڕێگا دەرەکیانەی بۆ دۆزینەوەی ئارەزووی نەفس لەپشت ئەو فیکرەی (جێگەی خیلافە) ئەوەیە کە بە ڕاشکاوی پێچەوانەی وەحی بی، قورئان یان سوننەت، چاوەنۆری چاکە لەو کەسە ناکری کە لە نەفسی خۆی وادادەنی ڕشتە لەسەر حەق، کەچی تەنگەتاوی فیکرەیەك بی پێچەوانەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

ئەوەی دەری دەخا کە فیکرەکە زادەی ئارەزوی نەفسە: تێککگیربونیەتی دەگەڵ خواستەکانی عەقڵی دروست کە خەڵك رازیە حوکمی پی بکری، ئەو فیکرەی داوای پەرستنی غەیری خودا یان حوکم کردن بەغەیری شەریعەتی خودا لەژیانی خەڵکدا دەکا، ئەو فیکرەی داوای رێگە دانی زینا بکا، یان پەرەپێدانی درۆ یان هاندان بۆ دەست بڵاوی لە مەسرەفدا، نابی لە ئارەزوی نەفس زیاتر هیچ سەرچاوەیەکی هەبی، کەسیش بانگەشەی بۆ ناکا مەگەر ئەوەی جڵەوی بەدەستی شەیتان بی.

ب. بەڵام رێگە خودییەکان بۆ دۆزینەوەی ئەوەی کە ئارەزوی نەفس پێکهێنەری فیکرە، بەجۆرێك لە رامان و وردبونەوە لە سەرچاوەی فیکرەکە دەبی، راستگۆیانە بەدوادا چونی نەفس سەبارەت بەهۆی گرتنەبەری ئەو فیکرە جیا لە هی ترو کاریگەری دۆخی دەوروبەر بەسەر خاوەن فیکرەکە و تا چەند پابەندی فیکرەکەی دەبی ئەگەر گۆرا؟ ئایا هیچ گوشارێك هەیە بۆئەوەی هەستی پی بکا رێرەوی ئاراستە کردبی؟ پاشان نقوم بوون لە قوڵایی فیکرەکە، ئەگەر لە دڵە راوکێی ناجێگیربی، لە نێوان هێز و بێهێزیدا بەدوی شعورێکی دیار کراو لە هاتوچوبوو، بزانە ئەوە زادەی ئارەزوی نەفس و فریوی شەیتانە، ئەوە پەنا بگرە بەخودای بیسەر و زانا و سوپاسی بکە لەسەر ئەوەی حەقیقەتی نیشاندای پێش ئەوەی جڵەوی کارت بکەوێتە دەست ئارەزوی نەفس.

٢ **خیلافی حەقخوازی بێ:**

جار هەیە خیلاف رودەدا بێئەوەی ئارەزو رۆڵی هەبی یان نەفس بەسەریدا زاڵ بی، ئەوە خیلافێکی هەق خوازە، زانست پاڵنەریەتی و داخوازی عەقڵە و ئیمان فەرزی کردوە، وەك موخالەفەی ئیمانداران دژی کوفر و شرك و نیفاق،خیلافێکی

واجبه نابیَ موسولمانێکی ئیماندار پشت گوێی بخات. یان بانگەشەی نەکردنی بکا.
چونکە خیلافیکە ئیمان پـێی راستە و هـەق دەیچەسـپێنێ. هـەروەها ئیختیلافـی
موسـولمانان دەگـەڵ خـاوەن عـەقیدەی کوفـر و بێبـاوڕان. وەك جولەکایـەتی و
گاورایەتی و بت پەرستی و شیوعیەتی. ئیختیلاف دەگەڵ ئەندامی ئەو ئوممەت و
عەقیدانـە نابێتـە هـۆی قەدەغـەکردنی بانگێشـە کـردن بـۆ لابردنـی هۆیـەکانی..بـە
هاتنیان بۆ سەر دینی خودا و وازهێنانیان لەو هۆکارانەی دەبنە مایەی خیلاف.وەك
کوفـر و شـرك و دووبـەرەکی و دوربویی و بـەد رەوشـتی و بێباوڕی و بیدعـە و رەواج
دان بە بیروباوڕی تێکدەر.

**٣. خیلافیَ لە نێوان پیا هەڵدان و سەرزەنشت دابیَ:**

بەلای هیچ یەکیان دا نەچتەوە. ئەوە خیلافە لەکاری لاوەکیدا. لەنێوان کۆمەڵە
گریمانێك دایە. هەندێکیان پەسندتر دەکرێن بەسەر هەندێکیتریان دا. لەبـەر هۆکەڵی
(ان شاء الله) باسـی دێـت. نمونـەی ئـەو دابەشـکرنەکەش: ئیختیلافـی زانایـان لـە
شکانی دەستنوێژ بەو خوێنەی لە برین دێ و رشانەوەی بە ئەنقەست و ئیختیلافیـان
لـە حوکمـی خوێندنـەوەی فاتیحە دوای ئیمـام و خوێندنـەوەی (بســـــم الله) پێـش
فاتیحە و دەربڕینی (ئامین)و شتیتر لەو نمونانەی نایەنە ژمار. ئەو جۆرە ئیختیلافـە
مایەی هەڵزەنینی قاچە. لەوانەیە ئارەزوی نەفس تێیدا تێکەڵی تەقوا. گومان تێکەڵی
زانست. پەسند تێکەڵی ناپەسند. رەد کراو تێکەڵی وەرگیراو بێ. رێگاش نیە بۆ خـۆ
پـارێزی لەو هەڵزەنینە تـەنیا بـە پـەیرەوی ئـەو رێسـایەی لـە ئیختیـلاف پـەنای بـۆ
دەبردرێ و زەوابتـیَ رێکـی بخا و ئادابێك بەسـەریدا زاڵ بـێ. ئـەگینا دەگـۆڕێ بـۆ
دووبەرەکی و بەربەرەکانی و دوژران. هەردوولای موخالیف لە پلەی تـەقواوە دەکەونە
ژێـر ئـارەزووی نـەفس و ئـاژاوە پەرەدەسـێنی و شـەیتانیش سـەرکەوتن وەدەسـت
دێنیَ.

# رای زانایان لەسەر ئیختیلاف

دەگەڵ ئەوەی رابەرد زانایان وشیاریان داوە لەسەر ئیختیلاف بە هەموو جۆرەکانی‌یەوە و تەئکیدیان لەسەر خۆ دورخستنەوە لێ کردوە.

ئیبن مەسعود ﷺ دەڵێ (خیلاف شەرە)[3] السبکی (رەحمەتی خودای لێبێ) دەڵێ: (...رەحمەت پێویستی بە نەبونی ئیختیلافە. خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿... وَلَكِنِ اخْتَلَفُوا فَمِنْهُمْ مَنْ آمَنَ وَمِنْهُمْ مَنْ كَفَرَ...﴾ البقرة: ٢٥٣.

هەروا لە سوننەتیشدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمویە: (انما هلكت بنو اسرائيل بكثرة سؤالهم واختلافهم على انبيائهم)[4] لەو بارەوە ئایەت و فەرمودە زۆرن. ئەمە و (سبکی) لە ژێر جۆری سێهەمی ئیختیلاف (ئەوەی لە نێوان پیاهەڵدان و سەرزەنشت دایە) سێ جۆری ریز کردوە و دەڵێ: (ئیختیلاف سێ بەشە. یەکەمیان لە ئوصول دایە.ئەوەیە کە لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە، بێگومان ئەوەیان بیدعە و گومراییە یان هەر کوفرە. دووەمیان لە بیروڕا و جەنگەکانە. ئەوەشیان حەرامە چونکە بەفیڕۆدانی بەرژەوەندییە. سێهەمیان لە لقەکانە. وەك ئیختیلاف لە حەڵاڵی و حەرامی و هاوشێوەیان.[5]

ئەوەش یەکلابۆتەوە کە کۆك بوون تێیدا (واتە لە سێهەمدا) چاکترە لە ئیختیلاف.هەروەك (رەحمەتی خودای لێبێ) لە سەرزەنشتی ئیختیلافدا ئاماژەشی

---

٣ بنوره (تأويل مختلف الحديث) لابن قتيبة ص٢٢ و(العواصم من القواصم) ص٧٨. وە بگەڕێوە بۆ (المحصول) (٢ق١/٤٨٠).

٤ تەواوی فەرمودەکە لە رێگەی (ابي هريرة)وەیە (ذروني ماتركتكم، فانما هلك من كان قبلكم بكثرة سؤالهم، واختلافهم على انبيائهم فاذا امرتكم بشئ فأتوا منه مااستطعتم، واذا نهيتكم عن شئ فدعوه) رواه أحمد في مسنده ومسلم والنسائي وابن ماجة على ما في الفتح الكبير (١٢٠/٢) والاحكام (٦٦/٥).

٥ بنوره الابهاج (١٣/٣).

بۆ وتەی ئیبن حزم کردووە، ئیبن حزم (ڕەحمەتی خودای لێبێ) هیچ شتێکی لە ئیختیلاف بە ڕەحمەت دانەناوە، بەڵکو هەمووی بە عەزاب داناوە.

بۆ زانینی زیانی ئیختیلاف و مەترسییەکەی ئەوەندە بەسە کە هارون پێغەمبەر ﷺ ئیختیلافی بە گەورەترین مەترسی و زەرەری سەختتر لەپەرستنی بت داناوە. کاتێ سامری گوێلکێکی لە زێڕ بۆ گەلەکەی دروست کرد و پێی گوتن: ﴿هَٰذَا إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ . . .﴾ طه: ٨٨ هارون بە لێزانییەوە ئامۆژگاری گەلەکەی کرد* و چاوەنۆڕی موسای برای دەکرد. کاتێ موسا ﷺ گەیشتەوەو بینی گەلەکەی گۆشەگیریان بۆ گوێلك کردوە. توندوتیژترین سەرزەنشتی ئاراستەی براکەی کرد. بەهانەی هارون لەوە زیاتر نەبوو کە گوتی: ﴿يَا ابْنَ أُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِي إِنِّي خَشِيتُ أَنْ تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾ طه: ٩٤ ترسی پەرتەوازەیی و ئیختیلافی نێو گەلەکەی کردە بیانو لەوەی کە توند نەبوو لەبەگژدا چوونیان و بەرگری و جیا نەبونەوە لە گەلەکەی لە کاتێکدا کە بەگژدا چوون سودی نابێ.

---

* قال تعالى ﴿وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَارُونُ مِنْ قَبْلُ يَا قَوْمِ إِنَّمَا فُتِنْتُمْ بِهِ وَإِنَّ رَبَّكُمُ الرَّحْمَٰنُ فَاتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوا أَمْرِي﴾ طه: ٩٠.

# ئیختیلافی هاوەڵان لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ

لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ شتێك نەبوو ببێتە مایەی ئیختیلاف بەو مانایەی باسمان کرد، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەرزامەندی هەمویان سەرچاوە بوو، لە هەر کارێك پەرتی کردبان بۆی دەگەڕانەوە. ترسینەریان بوو لە هەموو شتێك و ڕێ نیشاندەر بوو لە هەر سەرگەردانی‌یەك. ئەگەر هاوەلان خودا لێیان رازی بێ ئیختیلافیان لە شتێك هەبوایە دەیانگێرایەوە بۆ لای ئەو ﷺ رووی راستی بۆ دیاری دەکردن و ڕێگەی رزگاری بۆ روون دەکردنەوە. بەلام ئەوانەی کارێکیان دەکەوتە بەر و نەیاندەتوانی بیگەڕێننەوە لای پێغەمبەر ﷺ لەبەر دوریان لە مەدینەی منەوەرە. ئیختیلافیان دەکەوتە نێوان، وەك ئیختیلافیان لە تەفسیر کردنی قورئان یان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و پیادەکردنی لەسەر رووداوێ کە توشیان بووە، کاتی دەقێك نادۆزنەوە لەو بارەوە ئیجتهادیان جیاواز دەبێ. ئەوانە ئەگەر گەرانەوە مەدینە و بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتن. ئەوەی تێی گەیشتون لەو دەقانەی بەردەستیان یان ئەو ئیجتهادەی لەمەڕ رووداوێك کردوویانە دەیخەنە بەر دەستی، یا ئەوەتا رەزامەندی لەسەر دەردەبڕێ و دەبێتە بەشێك لە سوننەتی ﷺ یان ئەوەتا رووی هەق و راستیان بۆ دیاری دەکا و بە حوکمەکەی دڵنیا دەبن و پێی وەردەگرن و خیلافیان نامێنێ. نمونەی ئەوەش وەك:

١. بوخاری و موسلیم هێناویانە، پێغەمبەر ﷺ لەشەڕی ئەحزاب دا فەرمووی (لایصلین احد العصر الا في بني قريظة)* لە ڕێگا عەسریان لێ داهات. هەندێك گوتیان نوێژ ناکەین تاکو نەگەینە بەرەی (قریضة).

هەندیکی‌تر گوتیان: نوێژ دەکەین، مەبەستی ئەوە نەبوو لێمان. ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێرایەوە سەرزەنشتی هیچ کامیانی نەکرد.[1]

---

* هیچ کامتان نوێژی عەسر نەکات لە بەرەی قریظة نەبێ.

وەك لەو فەرموودە پیرۆزە دیارە هاوەڵان خودا لێیان ڕازی بێ سەبارەت بە کردنی نوێژی عەسر بوونە دوو دەستە. دەستەیەك ڕواڵەتی فەرموودەکەی وەرگرت (وەك منطقي‌یەکان دەڵێن) یا وەك ئصولیەکانی حەنەفی ناوی دەنێن (ڕواڵەتی دەق)، دەستەکەیتر مانایەکی تایبەتیان بە دەقەکە وەرگرت.

بەراست دانانی هەردوو دەستەکە لای پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ڕەوابونی هەردوو بۆچونەکە.

کەواتە موسوڵمان: بۆی هەیە ڕواڵەتی دەقەکە وەربگرێت، یا بۆی هەیە ئەو مانایە هەڵێنجێ کە دەقەکە دەیگرێتەوە و دەتوانێ بەڵگەی لەسەر بێنێ، ئەو کەسەی کۆشش دەکا و شیاوە بۆ ئەو جۆرە کۆششە سەرزەنشت ناکرێ.

دەستەی دووەمی هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێ) وا تێگەیشتن کە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە ئەندازەی خێرایی ڕۆیشتن بووە، هەر بۆیە وایان دانا کە کردنی نوێژ پێش ئەوەی بگەنە بەرەی (قريظـة) سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ نییە، کە نوێژ نەکردنە تابەرەی (قريظـة)، ماتول نوێژکردن لەگەیشتن دوایان ناخات.

چەند نایابە کە ئیبن القیم (ڕەحمەتی خودای لێبێ) ئیختیلافی زانایانی لەسەر بە ڕاست دانانی یەك لەو دوو دەستەیەی هێناوەتەوە و چاکترین کاری هەردوو لای دەرخستوە.

ئەوەی دەڵێ: چاکترین کار هی ئەوانە بوو کە لە ڕێگا نوێژیان کرد، پاداشتی کردنی نوێژ لە کاتی خۆی وەردەگرن و فەرمانی پێغەمبەریشیان ﷺ جێبەجێ

---

٦ بنۆڕە صحيح البخاري بە پەراوێزی فتح الباري (٣١٣/٧)، وارشـاد الساري والعيني (٢٥٤/٨) ومتن البخاري (٤٧/٥) لە کتێبی المغازی. بگەڕێوە بۆ (باب صلاة الخوف) و(مسلم) لە (كتـاب الصـلاة).

کرد. ئەوەی دەڵێ: چاکترین کار هی ئەوانە بوو نوێژەکەیان دواخست تا لە بەرەی (فریضة) بیکەن...[7]

حکیم ماتول پێغەمبەر ﷺ سەرزەنەشتی هیچیانی نەکرد. دەبوو زانایان (رەحمەتی خوایان لێبێ) بۆ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ فراوانتر بنوارن و سەرگەرمی کارێك نەبونایە کە پێغەمبەری خودا یەکلای کردوتەوە و کوتایی پی هێناوە.

- نمونەی‌تر وەك ئەوەی ابوداود و حاکم لە فەرمودەی عمرو کوری عاص هێناویانە، دەڵێ: لەشەری (ذات السلاسل)[8] شەوێکی سارد لەشم پیس بوو، ترسام ئەگەر خۆم بشۆم بفەوتێم. تەیەموومم گرت و پێش نوێژیم بۆ هاوریکانم کرد، ئەوهیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێرایەوە. فەرمووی: (یا عمرو صلیت باصحابك وانت جنب؟) ئەی عمرو بە لەشی پیس پێش نوێژیت بۆ هاوریکانت کرد؟ منیش هۆی خۆ نەشوشتنم پێگەیاند و گوتم: بیستومە خودای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ النساء: ٢٩ پێغەمبەر ﷺ پێکەنی و هیچی نەفەرموو.[9]

## تەئویل و جۆرەکانی

لەومنین لەبارەی هەموو ئەو ئیختیلافانەی هاوەلان بدوێین لەسەردەمی پێغەمبەرو ﷺ دوای ئەویش لە نێوان وەرگرتنی روالەتی دەق و وردبونەوە و وەرگێرانی بەهەموو روویەکی داو هەڵێنجانی جۆرەها مانا لێی، ئەوە کارێکە درێژە

---

[7] علام الموقعين.

[8] شوێنێکە لە شام.

[9] بنوره سنن ابي داود فەرمودەی (٣٣٤) باب (اذا خاف الجنب البرد) بخاري به (معلق)ی دەریهیناوە. بنوره فتح الباری (٣٨٥/١) وە نیل الاوطار (٣٢٤/١).

دەکیشی و بیجگە لەو باسە چەندین بەرگ بەش ناکا. چونکە ئەوان ﷺ لە واقیعدا تیگەیشتبون کە ئەو دینە ئاسانە و ئەو شەریعەتە والایە بۆ دوو ریگە و دوو ریرەو.

موجتەهیدانی شارەزا و زانایانی کارامە تیدەکوشن بۆ روونکردنەوەی هەرشتێ گشتیتی شەریعەت دەستەبەر دەکا و دەیگەیەنیتە مەبەستەکانی. هەندیك جار ئەوشتە بە وەرگرتنی روالەتی وتەکە دەبێ و هەندیك جاریتر بە وەرگرتنی ئەوە دەبێ کە لەپشت روالەتی وتەکەیە. ئەوەش بە تەئویل ناسراوە. رەنگە سودی هەبێ ئەگەر تیشکیك بخەینە سەر ئەو بابەتە و بەکورتی جورەکانی تەئویل و مەرجەکانی بخەینە روو.

تەئویل. لە وەرگرتنی ئەوەی لە پشت روالەتی وتەکەیە دیت. بریتی‌یە لە:

**١. تەئویلی نزیك:**

دەکری ئەوەیان بە کەمترین تیرامان بناسری. دەگەل شیمانەی گەرانەوەی وتەکە بۆی، وەك:

خیرکردن بە مالی هەتیو. یان بەحشینی بەغەیری خوی. یان بە فیرودانی. یەکسانە بە خواردنی یان حەرامترە، ئەوەش خودای گەورە باسی کردووە و فەرموویە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا﴾ نساء: ١٠.

یان وەك: میزکردن دە دەفریك داو پاشان میزەکە بکریتە ناو ئاوێکی راوەستاو، وەك راستەوخۆ میز دە ئاوەکە بکریت وایە، ئەوەش بە فەرمودەی پیغەمبەر ﷺ نەهی کراوە: (لایبولن احدکم فی الماء الدائم، ثم یغتسل فیه).[10]

---

١٠ متفق علیه ... الجامع الصغیر (٢/٥٠١) هەروەها ابو داود والنسائی واحمد و الترمذی وابن ماجة لە الفتح الکبیر (٣/٣٢٢) دەریان هیناوە.

بەو پێیە کە هەردو کارەکە دەبێتە هۆی پیس بوونی ئاو و ورووژێنەری وەسوەسە.

### ٢. تەئویلی دوور: *

بۆ ناسین و گەیشتن بە تەئویلی دوور پێوستی بە تێرامانی زیاتر هەیە چونکە وتەکە ئەوە هەڵدەگری. وەك كوڕی عەبباس ﷺ لەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ:

﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴾ الاحقاف: ١٥ دەگەڵ ئایەتی ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾ البقرة: ٢٣٣ ئەوەی هەڵێنجا کە کەمترین ماوەی سك پڕی شەش مانگە .

یان وەك ئیمام شافیعی (رەحمەتی خودای لێبێ) كۆڕای زانایانی بە بەڵگە داناوە. بەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾ النساء: ١١٥.

هەروەها ئوصولییەکان ئایەتی:

﴿ فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴾ الحشر: ٢ دەکەنە بەڵگە لە سەر ئەوەی کە قیاس بەڵگەیەکی شەرعییە.

ئەو دەرەنجامانە گەرچی ئاسان دیارن. بەلام گەیشتن پێیان زەحمەتە ئەگەر مرۆڤ فیکرێکی قوڵ و نیگایەکی تیژی نەبێ. هەروەك پێوستی بە تێرامان و وردبونەوە هەیە کە بۆ خەڵکی ئاسایی ئاسان نییە.

### ٣. تەئویلی بە دوور دانراو:

ئەوەیە کە وتەکە هەڵی ناگری. تەئویلکەریش بۆتەئویل کردنی هیچ جۆرە بەڵگەیەکی نییە. وەك تەفسیری هەندێك کەس بۆ ئایەتی:

﴿ وَعَلَامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴾ نحل: ١٦.

گوایه (النجم) پیغەمبەرە ﷺ، (علامات)یش ئیمامەکانن. یان وەك تەفسیری هەندیکیتر بو ئایەتی: ﴿ وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ ﴾ یونس: ١٠١.

گوایه (الآيات) ئیمامەکانن و (النذر) پیغەمبەرەکانن.

یان وەك تەفسیری خەلکانیتر بو ئایەتی:

﴿ عَمَّ يَتَسَاءلُونَ عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ ﴾ نبإ: ٢،١.

کە ﴿ النَّبَإِ الْعَظِيمِ ﴾ بە ئیمام عەلی لیك دەدەنەوە.[11]

## مەرجەکانی تەئویل

ئەوەی باسمان کرد دەردەکەوی کە تەئویل سەرەرای توانا بوون لە سەر بیرکردنەوە و تیرامان، پیویستی بەو شتە هەیە کە دەلالەتی دەکاتە سەر و پەنای بو دەبا. ئەگەر نا وەرگرتن بە روالەت دروستترە. دەرگەی تەئویل بو کارە ئیجتهادیەکان نەبی ناکریتەوە، بەلام لە مەسەلەکانی عەقیدەیی هیچ بواری ئیجتهاد نییە. وەرگرتن بە روالەتی دەقەکان و تەفویز کردنی ماناکانی جی مەبەست هەردەم دروستترە. ئەوەش هەلویستی سەلەفە ﷺ، لەکاتی ناچاری بو تەئویل، تیگەیشتن لە دەق و شیکردنەوەی و زانینی گشت روالەتی کە دەقەکە دەیگەیەنی و زمانەکە دەیگریتەوە و مەبەستەکانی شەریعەت دەبنە پالپشتی و سەرچەم ئیسلام و ریسا گشتییەکانی یاریدەدەریەتی پیوستە.

---

١١ بنوره اصول الكافي (١/٢١٦).

هەر بۆیە حوکمکردن لەسەر رواڵەتی دەق یان شیکردنەوەی بۆ زانینی هەموو ڕوەکانی، لە گرنگترین لیکدانەوەی ئیجتهادی فیقهی و ئیعتباری شەرعی دابنرێ کە لە فەرمودەی خودا فەرمانی پێکراوە:

﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ الحشر: ٢.

ئیبن عەباس ﷺ کاتێ مەرجەکانی تەفسیر باس دەکا چوار ڕوی بۆ دیاری دەکا:

- ڕوویەکی عەرەب لە قسەکردن دەیناسی.
- ڕوویەکیتر هیچ کەس بەهانەی نەزانینی بۆ نییە.
- ڕوویەکی دیکەی زانایان دەیزانن.
- دوایین ڕووی خودا نەبی کەس نایزانێ.

مانــاو جۆرەکــانی تــەئویل بــەو شــێوەیەی کــە ڕوون کرایــەوە دەردەکــەوێ پەیوەندیەکی بەهیز لە نیوان تەئویل و تەفسیردا هەیە.

زۆر جار لە بەکارهینانی قورئاندا هەر یەکێکیان لە جیگەی ئەویتر هاتوە. وەك لە ئایەتی:

﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ، وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ﴾ آل عمران: ٧.

زۆربەی موفەسیرەکان وای بۆچوونە کە لیرەدا مەبەست لە تەئویل: تەفسیرکردن و ڕوونکردنەوەیە، نموانە: طبري، کە لە ئیبن عەباس و هەندیك (سەلەف)ی تری وەرگرتوە. (ڕەحمەتی خودایان لیبی)

هەروەها لە نزای پیغەمبەر ﷺ بۆ ئیبن عەباس ﷺ هاتوە (اللهم فقهه في الدين وعلمه التأويل) خودایە شارەزای کە لە دین و تەئویلی فیرکە. تەئویل بەمانای تەفسیر و ڕوونکردنەوە بەکار هاتووە. هەرچەندە هەندیك لە زانایان، وەك راغب الاصفهاني لە (مفردات)دا، تەفسیری لە تەئویل سەفراوانتر داناوە. هەروەها ئامازەی داوە کە

تەفسیر زیاتر بۆ روونكردنەوە و شیكردنەوەی وتە بەكاردێ، بەڵام تەئویل زیاتر بۆ رونكردنەوەی مانا و رستە بەكاردێ.

هەروەها ئاماژەی كردوە كە تەئویل زیاتر بە هەڵێنجانی مانای دەقەكانی قورئان و سوننەت دەگوترێت، بەڵام تەفسیر هەڵێنجانی مانای دەقەكان و هیتریش دەگرێتەوە.

بەڵكو ئەو پەیوەندییە بەهێزەی نێوان ئەو دوو زاراوەیە بە تایبەتی لە بەكارهێنانی قورئان و سوننەت، رێگەمان پێدەدا ئەو مەرجانەی كە تایبەتكاران بۆ تەفسیریان داناوە بخوازرێن و بكرێنە مەرجی تەئویلیش. ئەوەی گومانی تێدانییە چەند شتێك لە قورئاندا هاتووە، خودای بەرز زانینی تایبەت كردوە بە زاتی خۆی. وەك ناسینی هەقیقەتی ناو و چۆنیەتی سیفەتەكانی و زانینی غەیب و شتی لەو بابەتە. هەروەها كاروباریتر هەیە پێغەمبەری ﷺ لێ ئاگاداركردوە و تایبەتی كردوە بە زانینی ئەو ﷺ بێگومان كەس بۆی نییە بە تەفسیر یان تەئویل كردنیان خۆ لە وێنەی ئەو باسانە بدا. بەڵكو لەسەریەتی پابەندی ئەو سنورانە بێ كە قورئان و سوننەت دیاریان كردوون.

بەشی سێیەمیش: ئەو زانستەیە كە خودا فێری پێغەمبەرەكەی ﷺ كردوە و لە قورئاندا دایناوە، فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ كردوە بە فێربونی و روونكردنەوەی. ئەو بەشەش لە دوو جۆر پێك دێ:

**یەكەم:** ئەوەیە كە نابێ خۆی لێ بدەین تەنیا بە بیستنی نەبێ، وەك هۆی دابەزین و ناسخ و مەنسوخی قورئان و شتیتر...

**دووەم:** ئەوەیە بە رێگەی نواڕین و ئیستدلال وەرەدەگیرێ، بۆ ئەوەشیان لای تایبەتكاران دوو بۆچوون هەیە:

أ. بەشـێکیان ئیختیلافیـان هەیـە لـە رەوابوونـی تـەئویل کردنـی. وەك ئایەتەکانی ناو و سیفەت. بە پـێی مەزهەبی سەلەف: تـەئویل کردنیـان قەدەغەیە، هەر ئەوەش راستە.

ب. بەشێك لەسـەر رەوابوونـی رێـك کـەوتوون، وەك هـەڵێنجانی حوکمـە شەرعییەکان لە بەڵگە تەفصیلییەکانەوە، ئەوەش بە (فقه) ناسراوە.

زانایان چەند مەرجێکیان بۆ تەئویل و تەفسیر داناوە، لەوانە:

**یەکەم:** نابێ تەئویل مانای رواڵەتی زانراوی وتەکە لابدا کە بەپێی ڕێزمان و دابی عەرەبی لە دەربڕیندا هەیە.

**دووەم:** نابێ دژی هیچ دەقێکی قورئانی بێ.

**سێیەم:** نابێ پێچەوانەی بنەمایەکی شـەرعی بێ کـە زانـا و ئیمامـەکان لەسـەری کۆڕان.

**چوارەم:** پێویستە چاودێری ئەو مەبەستە بکا کە دەقەکە بۆی هاتووە لە میانەی هۆی دابەزین و هاتنی.

بەلام دەتوانین جۆرەکانی تەئویلی نارەوا و رەدکراو، لە ژێر ئەو بەشانە ریز بکەین:

**یەکـەم:** تەئویل و تەفسیری کەسانی ناشایستە، کە شارەزایی و زانستی تـەواویان لە زمان و رستە سازی و باقی پێویستیەکانی تەئویلدا نییە.

**دووەم:** تەئویلی متشابهەکان (وێك چووەکان) بێ بنگە (سند)ێکی دروست.

**سێیەم:** ئەو تەئویلانەی دەبارانیان دایە بڕیاری مەزهەبی گەندەل بدەن پێچەوانەی قورئان و سوننەت، یان ئەو شتەی موسوڵمانان لەسەری کۆڕان.

**چـوارەم:** تـەئویل کـردن و رشـت بـوون لەسـەری بـە بـێ بەڵگـە، گوایـە مەبەسـتی یاسادانەر ئەوەیە.

**پێنجەم:** تەئویل بەپێی هەوا و ئارەزوو، وەك تەئویلی (باطنی)یەکان و هاووێنەیان.

ئەو تەئویلە رەدکراوانە هەمووی لەژێر تەئویلی بەدوور دانراو ریز دەکرێن، وەك پێشتر باسمان کرد.

## هاوەڵانی خاوەن ئیجتهاد

لەبەر گرنگی و مەترسی ئیجتهاد و ئەو شوێنەوارەی لێی دەکەوێتەوە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تەنیا شایستە و لێهاتووەکان نەبێ، ئیجتهادیان نەدەکرد.

کە یەکێکی‌تر دەیکرد و بە هەڵە دادەچوو پێغەمبەر ﷺ نکوڵی دەکرد، ئیتر کەس دانی پێدا نەدەنا.

- ابو داود و دار القطنی فەرمودەیەك لە جابرەوە دێنن، دەڵێ: (بۆ سەفەر دەچووین پیاوێك لە ئێمە بەردێکی وەسەری کەوت، پاشان لەشی پیس بوو، لە هاورێکانی پرسی: روخسەتم هەیە تەیەموم بکەم؟ گوتیان: هیچ روخسەیەکت بۆ نی‌یە چونکە دەتوانی خۆت بشۆی، خۆی شوشت و پێی مرد. بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتین و هەواڵمان پێدا. فەرمووی: (قتلوه قتلهم الله، ألا سألوا اذ لم يعلموا فانما شفاء العي السؤال، انما كان يكفيه ان يتيمم، ويعصر أو يعصب -شك من راوي الحديث- على جرحه خرقة، ثم يمسح عليها ويغسل سائر جسده...) واتە: کوشتیان خودا بیان کوژێ، ئەگەر نەیان دەزانی بۆ پرسیان نەدەکرد، چونکە دەرمانی نەزانین پرسینە. تەیەمومی کردبوایە بەس بوو، پەرۆیەکی لەسەر برینەکە بەستبایە پاشان مەسحی کردبوایە و ئەوجار لەشی بشۆریایە.[12] (گومان لە گێرەوەی فەرمودە هەیە).

پێغەمبەر ﷺ عوزری فەتوادەرانی وەرنەگرت، بەڵکو سەرکۆنە و سەرزەنشتی کردن کە فەتوایان بێ زانین داوە، وەك ئەوەی دانا کە خۆیان کوشتویانە، ئەوەشی روون

[12] سنن ابی داود (باب فی المجروح التیمم) فەرمودەی (٣٣٦) ابن ماجه هیناویەتی فەرمودەی ژمارە (٥٧٢) و صححه ابن السکن، بنورە نیل الاوطار (١/٣٢٣).

کردەوە کە پێویستە لەسەر هەرکەسی نازانی و رێگە دەرناکا پرسیار بکا نەك بەپەلە و بێ زانین فەتوا بدا. لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە پێویستی پرسین وشیاری داوە ئەوەیە کە لە قورئانی پیروزدا هاتووە: ﴿فَسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ النحل: ٤٣.

- ئیمام ئەحمەد و بوخاری و موسلیم و ابو داود ونەسائی و تەبەرانی لە ئوسامەی کوری زەید هیناویانە، دەلی: پێغەمبەر ﷺ لە مەفرەزەیەکدا (شانەیەکدا) بو سەر سوتینەرەکان (حرقات)ی ناردین لە جوهینە، بە پیاویك گەیشتم گوتی: لا اله الا الله، رمیکم لیدا و کوشتم. لە دلم دەرنەدەچوو، بو پێغەمبەرم ﷺ باس کرد. فەرمووی: (گوتی لا اله الا الله و کوشتت؟!) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا، لە ترسی چەکەکەم وای گوت. فەرموی: (افلا شققت عن قلبه حتى تعلم من اجل ذلك قالها أم لا؟ من لك بلا اله الا الله يوم القيامة؟) واتە: ئایا دلت شەق کرد تا بزانی لەبەر ئەوە گوتویەتی یان نا؟ لە روژی قیامەتدا کی بوتو بە لا اله الا الله هەیە؟ بەردەوام دوبارەی کردەوە، تا بە ئاوات بووم پیش ئەو روژە موسولمان نەبوایەم.[١٢]

لە فەرمودەی یەکەمدا پێغەمبەر ﷺ نکولی لە هاوەلان کرد لەسەر وەرگرتن بە گشتیتی ئەو بەلگەیە کە پیدادەگری لەسەر پێویستی بەکارهینانی ئاو لە کاتی بونیدا. بێ لەبەر چاو گرتنی حالەتەکەی.

ئاگاداری فەرمودەی خودا نەبوون کە فەرمویە:

﴿وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً﴾ المائدة: ٦ نەیانپرسی و خوشیان خاوەن را نەبوون.

---

١٢ بە کەمی جیاوازی لە هەندیك وتەکانیدا هاتوە، بنورە: البخاري (٣٩٨/٧).

بەلام لە فەرمودەی ئوسامە ئەوە تیدەگەین. کە ئوسامە ﷺ. ئەو ئایەتەی تەئویل کرد:

﴿ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا ﴾ غافر: ٨٥.

وای بۆ چوو کە ئایەتەکە نەدانی سود لە دونیا و قیامەت دەگەیەنی، گشتی‌یە بۆ هەردو حالەتەکە و هەر تایبەت بە دوا رۆژ نی‌یە. وەك لە ئایەتەکەوە دیارە. رەنگە ئەوە بوبیتە هوی سەرزەنشتی لای پیغەمبەر ﷺ.

ئەوە هەندیك فەتوای هاوەلان بوو ﷺ کە پیغەمبەر ﷺ بریاری لەسەر نەداون.[١٤]

خەلکان داوای فەتوایان لیدەکرد. پیغەمبەریش ﷺ لە روداوەکان فەتوای بۆ دەدان. کیشەکان بۆ لای بەرزدەکرانەوە و حوکمی لەسەر دەدان.[١٥]

کاری چاکی دەبینی پەسنی دەدا و ستایشی بکەری دەکرد، سەرپیچی کاری دەبینی نارازی دەبوو. هاوەلانیشی ﷺ ئەو شتانەی لی‌ی فیردەبوون بو یەکتریان دەگیرایەوە و لە نیو خەلکان بلاو دەبووە. ئیختیلافیشیان بە پالنەری رشت بوون لەسەر هەق دەبوو، گوتوبیژیان لەمەر ئەوە دەکرد کە ئیختیلافیان تییدا هەیە، بی ئەوەی سنوور ببەزینن بۆ کیشە و دوویەرەکی و تۆمەت دانە پال یەك و تەشەر لیکتردان.چونکە بە گەرانەوەیان بۆ کتیبی خودا و پیغەمبەرەکەی ﷺ هەموو ناکوکیەکیان یەکلا دەکردەوە بی ئەوەی هیچ خلتیك بمینیتەوە و گەرد بخاتە سەر برایەتی‌یان.

---

١٤ ابن حزم کومەلیکی زور فەتوای هاوەلانی ژماردوە کە پیغەمبەر ﷺ بریاری لەسەر نەداون. بنوره: الاحکام (٦/٨٤-٨٥) و (٢/١٢٦-١٢٧).

١٥ بنوره: حجة الله البالغة (١/٢٩٨).

## پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی لە ئیختیلاف ئاگادار دەکاتەوە

پێغەمبەر ﷺ دەیزانی گرنگترین هۆی مانەوەی ئەو ئوممەتە هۆگری دڵەکانە کە لەسەر خۆشەویستی لەبەر خودا پێک دەگەن، فەوتانی ئوممەتیش لە رق و قینی نێودلانە. بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری دەدا لەوەی ناکۆکی زمانەی بکێشی. دەیفەرموو: (لا تختلفوا فتختلف قلوبكم).[16] هاوەڵە بەرێزەکان ﷺ بروایان وابوو کە خیلاف خێری پێوە نییە. هەروەك کوری مەسعود ﷺ فەرمویە (خیلاف شەرە).

بۆیە پێغەمبەر ﷺ خیلافی ریشەکێش دەکرد پێش ئەوەی گەشەبکا. عەبدوڵلای کوری عومەر ﷺ دەڵێ: رۆژێك چومە لای پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگی دوو پیاو بوو ئیختیلافیان لەسەر ئایەتێك هەبوو. پێغەمبەر ﷺ چوە دەرەوە و تورەیی بە روویەوە دیار بوو. فەرموی: (انما هلك من كان قبلكم باختلافهم في الكتاب) واتە: (ئەوانەی پێش ئێوە لەبەر ئیختیلافیان لە کتێبدا بە هیلاك چون).[17]

نزال کوری سبرە دەڵێ: گویم لێ بوو (عەبدوڵلای کوری مەسعود) گوتی: گویم لە پیاوێك بوو ئایەتێکی خوێندەوە خیلافی ئەو ئایەتەم لە پێغەمبەر بیست. دەستی پیاوەکەم گرت بردمە لای پێغەمبەر ﷺ. فەرموی (هی هەردوکتان راستە). شوعبە دەڵێ: وا بزانم فەرموی: (لا تختلفوا فان من قبلكم اختلفوا فهلكوا) واتە: (ئیختیلافتان نەبێ ئەوانەی پێش ئێوە ئیختیلافیان هەبوو بە هیلاك چون).[18]

بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵان و ئەوانەی دوای ئەوان فێر دەکا و سەرەنجامی ئیختیلاف ئاگاداریان دەکاتەوە.

---

١٦ بوخاری هێناویەتی لە: الجامع الصغير (٢/٤٩٤).

١٧ بنوڕە: الاحكام في اصول الاحكام لابن حزم (٥/٦٦).

١٨ بگەڕێوە بۆ: الاحكام في اصول الاحكام لابن حزم، بنوڕە: صحيح البخاري (باب كراهية الاختلاف) (١٣/٢٨٩) و باب (نزل القرآن على سبعة احرف) (٩/٢٢-٣٦).

پیغەمبەر ﷺ هاوەڵانی فێری ئەدەبێکی گرنگ لە ئەدەبی ئیختیلاف دەکرد. بە تایبەتی لە خوێندنەوەی قورئاندا. لە فەرمودەی صحیحدا دەفەرمووی: (اقرأوا القرآن ما ائتلفت عليه قلوبكم فاذا اختلفتم فيه فقوموا).[19]

هانی هاوەڵانی دەدا ئەگەر لە خوێندنەوە ئیختیلافیان لە هەندێک تیپی قورئاندا یان لەمەبەست و مانای ئایەتە پیرۆزەکانیدا هەبوو لەسەری هەڵسن تاکو نەفس و دڵ و هەستیان ئارام دەبێتەوە و هۆی توند و تیژی دەمەقاڵێ نامێنێ. کە سەر دەکێشێ بۆ کێشە و دووبەرەکی. بەڵام ئەگەر دڵەکان هۆگربوون، ئارەزووی دڵسۆزانە لە تێگەیشتن دا زاڵ بوو. لەسەریانە درێژە بدەن بە خوێندنەوە و تێرامان و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی قورئان. دەبینین هەندێک جار قورئانی پیرۆز کاتی ئیختیلاف دەکەوێتە نێو هاوەڵان وریاکردنەوە لەسەر (ئەدەبی ئیختیلاف) رادەگەیەنێ. عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر دەڵێ: (نزیک بوو هەردوو پیاو چاک ئەبوبەکر و عومەر بە هیلاک بچن. لە لای پێغەمبەر ﷺ دەنگیان بەرز کردەوە. ئەو کاتەی تاقمی لەبەرەی تەمیم هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکر ئاماژەی بۆ اقرع کوڕی حابس کرد کە بکرێتە سەرکردەیان، عومەر ئاماژەی بۆ قعقاع کوڕی معبد کوڕی زرارە کرد. ئەبوبەکر بە عومەری گوت: مەبەستت هیچ نییە تەنیا پێچەوانەی من نەبێ. عومەر گوتی: مەبەستم پێچەوانەی تۆ نییە. لەوە دەنگیان لێ بەرز بووە. خودای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ..﴾ الحجرات: ٢ کوڕی زوبێر دەڵێ: لە پاش ئەو رووداوە عومەر وا قسەی نەدەکرد پێغەمبەر ﷺ بیبیستێ تاڵێ نەپرسیبایەوە.[20]

---

١٩ موسلیم و بوخاری و ئەحمەد لە مەسند و نسائی لە (الجامع الصغير) (١/٨٦) و الفتح الكبير (١/٢١٨) هێناویانە.

٢٠ فەرمودەی بوخارییە بنۆرە پەراوێزی شەرحەکەی الفتح (٨/٦٦و٤٥٤) و (١٣/٢٣٥).

## نیشانەكانی ئەدەبی ئیختیلاف لە چەرخی پێغەمبەرێتی

لە ژێر تیشكی ئەوەی باسكرا دەتوانین نیشانەكانی (ئەدەبی ئیختیلاف) لەو چەرخەدا بەم شێوەیە كورت بكەینەوە:

هاوەلان ﷺ هەوڵیان دەدا تا بكرێ ئیختیلافیان نەبێ، زۆرباسی مەسەلەی جیا جیـا و لـك و پۆداریـان نـەدەكرد[21] بـەڵكو لـە ژێـر سـێبەری ڕێنوێنییـەكانی پێغەمبـەر ﷺ چـارەی ئـەو كێشـانەیان دەكـرد كـەڕوویان دەدا. چارەسـەری پێشهاتیش بە زۆری كەمتر بواری دەمەقاڵی دەدا چ جای كێشە و دووبەرەكی.

٢. ئەگـەر ئیختیـلاف ڕووی دابـا سـەرباری هـەوڵی دووربـەر، بەپەلـە بـوون شـتی ئیختیلاف لەسەر بگێڕنەوە بۆ قورئان و پێغەمبەر ﷺ یەكسەر خیلاف نەدەما.

٣. خێرا مل كەچ و پابەند دەبـوون بـە حوكمـی خـودا و پێغەمبـەر ﷺ بـە تـەواوی تەسلیمی دەبوون.

٤. پێغەمبـەر ﷺ لـە زۆر لـەو كارانـەی شـێمانەی تـەئویلی لێ دەكـرا هـەردوو لای موخالیفی بەڕاست دادەنا. هەریەكێكیان لای وابوو ئـەوەی براكـەی بـۆی چـوە پێدەچی ڕاست بێ، وەك چۆن خۆی پێ ڕاستە. ئەو هەستەش زامنـی پاراستنی ڕێزی هەریەكێكیان بۆ براكەی و دوركەوتنەوە لە دەمارگیری بۆ بیروڕا دەكا.

٥. پابەند بوون بە تەقوا و دوركەوتنەوە لە ئارەزو، ئەوەش دەباریدایە كەوا بكا تەنیا هەقیقەت ئامانجی هەردولا بێ. هیچ كامیـان لایان گرنـگ نـەبێ هەقیقـەت لەسـەر زمانی خۆی یان براكەی دەردەكەوێ.

٦. پابەندیان بە ئادابی ئیسلامی لە دەربڕینـی وشـەی پـاك و دوركەوتنـەوە لە وتـەی بریندارکەر لە نێوانیان، دەگەڵ چاك گوێ ڕاگرتنیان لەیەكتر.

---

21 بگەرێوە بۆ فتح الباري (١٣/٢١٩ - ٢٢٨).

٧. خۆ دورگرتن بەپێی توانا لە بەملا و ئەولاداچوون و هەموو جۆرە هەولێکیان تا ئەوپەڕی لە بابەتی باسەکەدا، کە ئەوەش سیفەتی جدییەت و ڕێزگرتن لە لایەنێک بۆ ڕای لایەنەکەی‌تر دەدات و هانی موخالیفەکە دەدات ڕازی بی یان هەولی خستنە ڕوی ڕایەکی لەو چاکتر بدات.

ئەوە دیارترین نیشانەکانی (ئەدەبی ئیختیلاف)ە کە دەتوانری بە نموونە بهێنرێنەوە، لەو ڕوداوانە کورتمان کردۆتەوە کە لە چەرخی پەیامبەریتی سەریان هەڵداوە.

## ئیختیلاف لە چەرخی هاوەڵان و ئادابەکەی

هەندێك نوسەری گۆڕەپانی ئیسلامی هەوڵیاندا بە شێوەیەك وێنەی چینی هاوەڵان بکێشن کە خەڵکی گشتی پێی وابێ ئەو چینە نەك هەر جیاکراونەتەوە، بەڵکو دووبارەبونەوەی ئەستەمە. ئەوەش سوکایەتی‌یەکە بۆ ئیسلام و هیچی کەمتر نی‌یە لە سوکایەتی ئەو گومڕابوانەی کە وای بۆ دەچن دڵواکردنی گەڕانەوەی ژیانی ئیسلامی لە سێبەری قورئان و سوننەت پاش چەرخی هاوەڵان ئەستەمە و پێویستە گەردنی بۆ بەرز نەکرێتەوە. بەم شێوەیە دەیانەوێ پشکوی هیوا لەو دەرونانە خامۆش بکەن کە هەردەم پرشنگ دەدا بۆ ژیانێك لە سێبەری شەریعەتی بێ گەردا هاوەڵان ﷺ ئوممەتێك بوون قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ پەروەردەی کردن، قورئان و سوننەت لە نێوماندا هەنە و ئەگەر بکرێنە بەرنامە و ڕێباز بەردەوام دەتوانن ئوممەتێکی ڕەببانی لە هەموو کات و شوێنێك پەروەردە بکەن، خەڵکیش مامەڵەیان دەگەڵدا دەکەن وەك چۆن هاوەڵان دەیانکرد و هەتا ڕۆژی قیامەتیش هەر ئاوا دەمێننەوە.

پڕوپاگەندەی ئەستەمی دووبارەبونەوەی پێشەنگی یەکەم وەك ئەوە وایە سیفەتی پەك کەوتویی بدرێتە پاڵ قورئان و سوننەت. لەوەش دا هەوڵێکە بۆ ئەوەی

بیسەلمێنن کە کاریگەریان لە ژیانی خەڵکی دا بە پێی بارودۆخێکی دیارکراوە. دەڵێن ڕۆژگاری ئێمە لە قورئان و سوننەتی تێپەڕاندوە، بەوەی کە ڕژێمی ژیانی بوخۆی داهێناوە. ئەو گوتەیەش خاوەنەکەی بەرە و کوفرێکی ئاشکرا دەبات. هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئیختیلافیان لە زۆر شتدا هەبوە. ئەگەر ئەو ئیختیلافە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ ڕووی دابێ، گەرچی تەمەنیشی هەرئەوەندە بوە تا بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتوە، کەواتە چۆن دوای ئەو ئیختیلافیان نابێ؟ لە ڕاستیدا ئیختیلافیان هەبوە بەڵام ئیختیلافیان چەند هوگەل و ئادابێکی هەبوە. هەندێك لەو شتانەی کە ئیختیلافیشیان تێیدا هەبوە، لە کاری ترسناك بوون، وەك:

### ١. ئیختیلافیان لەسەر وەفاتی پێغەمبەر ﷺ

دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ یەکەم ئیختیلافی نێوانیان سەبارەت بە هەقیقەتی وەفاتی بوو. پێشەوامان عومەری کوڕی خەتاب ﷺ ڕشت بوو لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ نەمردوە، گوتەی مردنی بە پیلانی دووڕوان دانا و لەسەری هەڕەشەی لێ کردن. تا ئەبوبەکر ﷺ هات و ئەو فەرمودانەی خودای بۆ خەڵك خوێندەوە:

﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ آل عمران: ١٤٤.

﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ﴾ الزمر: ٣٠.

عومەر شمشێرەکەی لە دەست بەربووە و بەچوك دا كەوتە سەر زەوی. دلنیا بوو لە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ و پچڕانی سروش. عومەر دەربارەی ئەو ئایەتانەی كە ئەبوبەكر خوێندنیەوە. دەڵێ (وەڵلاهی. وەك ئەوەی قەت نەمخوێندبنەوە وابوم).[22]

ئیبن عەباس لە پێشەوا عومەر ﷛ دەگێڕێتەوە. لە كاتی خەلافەتی خۆی پێی گووتوە:

(ئەی ئیبن عەباس ئایا دەزانی چی وای لێكردم ئەو قسەیە بڵێم كە لە كاتی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ گوتم؟ دەڵێ. گوتم: نا ئەی میری باوەڕداران خۆت دەزانی. گوتی: وەڵلاهی ئەوەی وای لێكردم وابڵێم ئەوە بوو كە من ئەو ئایەتەم دەخوێندەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗا﴾ البقرة: ١٤٣ وەڵلاهی ئەو كات وا گومانم دەبرد كە پێغەمبەر هەر دەمێنێ لەناو ئوممەتەكەی دا دەمێنێتەوە تاكو دوایین كردەوەیان دەبینێ. ئەوەبوو وای لێكردم كە ئەوەی گوتم، گوتم)[23] وەك ئەوەی عومەر ﷛ ئیجتهادی لە مانای ئایەتەكە كردبوو. وا تێگەیشتبوو كە مەبەستی: بینینە لە دونیا. ئەوەش پێویستی مانەوەی پێغەمبەر ﷺ دەخوازێ. تا دوا ڕۆژی ئوممەتەكەی.

## ٢. ئیختیلافیان لە ناژتنی پێغەمبەر ﷺ

پاشان ئیختیلافیان لەو شوێنە دا بوو كە دەبوو تێیدا بینێژن. یەكێك گوتی (لە مزگەوتی خۆی دەینێژین) یەكێكی‌تر گوتی: (دەگەڵ هاوەڵانی دەینێژین). ئەبوبەكر ﷛ گوتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: (هەر پێغەمبەرێك گیانی

---

٢٢ بنوره الاحكام (٢-١٢٥) و تەفسیری ابن كثیر (٤/٥٢) وا چاكە بنوریە الطبري (٤/٢٠٢/٣) و سیرة ابن هشام (٢/٦٥٥)

٢٣ سیرة ابن هشام (٢/٦٦١، ٦٦٦) لێی دەگێڕنەوە كە لە مزگەوت لە كاتی پەیماندان بە ئەبوبەكر ئەوەی گوتوە.

کیشرا بی لە شوێنی گیان کیشرانی نیژراوە). ئەو حەسیرەی بەرز کردەوە کە لەسەری وەفاتی کردبوو، لە شوێن ئەو دەستی بە هەڵکەندن کرد.[٢٤]

ئیختیلاف لەو دوو کارە ترسناکە هەر تەنیا بە گەرانەوە بۆ قورئان و سوننەت نەما.

## ٢. ئیختیلافیان لەسەر جێنشینی پێغەمبەر ﷺ

ئیختیلافیان بوو لەوەی جێنشینی لە کێ بێ؟ لە کۆچکردوان یان یارمەتیدەران؟ هەر بۆ یەکێکە یان زیاتر؟ هەروەك ئیختیلاف هەبوو لەسەر ئەو دەسەڵاتەی کە خەلیفە دەیبێ. ئایا هەمان ئەو دەسەڵاتەیە کە پێغەمبەر ﷺ هەیبوو بە سیفەتی ئەوەی فەرمانڕەوا و پێشەوای موسوڵمانان بوو یان کەمتر دەکرێ و جیاوازە؟!

ئیبن ئیسحاق دەڵێ: (کە پێغەمبەر ﷺ گیانی سپارد، کۆمەڵی یارمەتیدەران لایەنگریان لە سەعدی کوری عبادە کرد لە بنمیچی بەرەی ساعیدە، علی کوری ئەبی تالیب و زبێری کوری عەوام و تەلحەی کوری عەبدوڵلا لە ماڵی فاتیمە کەنارەگیربوون. باقی کۆچکردوان لایەنگری ئەبوبەکر بوون. أسید کوری حضێر لەبەرەی عبدالاشهل چوە پاڵیان)[٢٥] لەوەبوو فیتنەیەکی گەورە بقەومێ. ئەگەر ئەوە رووشیدابوایە کارێکی زۆر غەریب نەبوو، چونکە ئەو بۆشاییەی کەسایەتییەکی گەورەی وەك پێغەمبەر ﷺ چۆڵی دەکات، لە نێو ئوممەتێك کە تێیدا پێغەمبەر و سەرکردە بێ، ناتوانرێ بە ئاسانی پڕ بکرێتەوە. بە تایبەتی کە پیاوانێکیان تێدابوو، وێنەی عومەر، مردنی پێغەمبەر ﷺ لەو باروودۆخە لە مێشکیان دا بە دوور دەزانرا، هەر تاکێك لە هاوەڵان ئەوەندەی پێغەمبەر ﷺ خۆشدەویست، خۆشەویستتر لەو

---

٢٤ سەرچاوەی پێشو. سنن الترمذي فەرمودەی (١٠١٨).

٢٥ سيرة ابن هشام (٢/٦٥٦)

دڵەی نێو قەفەسەی سینگی، ئەوانە بوون دەست پێشخەریان دەکرد بۆ گرتنەوەی دڵۆپە ئاوی دەستنوێژی پێش ئەوەی بڕژێتە سەر زەوی، هیچ نەدەڕژایە خوارەوە مەگەر بۆ نێو دەستی یەکێکیان نەبێ، هەروەك لە حدیبیە رووی دا. هیچ ئوممەتێك لەسەر زەوی نەبووە پێغەمبەر و سەرکردەی خۆی خۆشویستبێت بە وێنەی خۆشەویستی هاوەڵان ﷺ بۆ پێغەمبەر ﷺ.

هیچ کامیان، لە خۆشویستنیان بۆی و هەیبەتێك کە دڵ و ئەندامەکانیانی داگرتبوو- سەرباری ئەوپەڕی تەوازوعی- نەیدەتوانی چاوی لە نورینی تیربکا، جا ئەگەر بە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ داچڵەکان رووبدا ئاساییە کە زۆربەیان هۆشیان لەدەست بدەن. بەڵکو کارەسات کردی و زیانیش لە وەدانییە. پێغەمبەر ﷺ دەستی رەحمەت بوو عززەتی دونیا و خۆشبەختی دوا رۆژی بۆ هێنان، دەگەڵ ئەوەش دا بەرزتر بوون لە ئازاری خەم و دەردی جودایی. ئەو فەرمودەیەی خودایان دەخوێندەوە: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ آل عمران: ١٤٤.

پاشان بەرەو کۆنترۆل کردنی بارودۆخ و پاراستنی دوایین پەیام و بەربەست دانان لە بەردەم هۆی ئاژاوە، هەنگاویان نا.

راستە سەرکردایەتی واقیعی بۆ ئەبوبەکر و پاشان بۆ عومەر بوو ﷺ کەس نەبوو لە موسوڵمانەکان گەردنی بۆ کەچ بکرێ، وێنەی: ئەبو بەکر و عومەر ﷺ ئەبوبەکر وەزیری پێغەمبەر و هاوەڵ و باوکی خێزانە خۆشەویستەکەی بوو، ئەو کەسە بوو لە هیچ کارێکی گرنگ لێی جیا نەدەبووە. عومەریش ﷺ هەر خۆی عومەر

بوو. موسولمان بوونی بۆ موسولمانان عززەت بوو. کۆچکردنی شکاندنی لوتی هاوبەش ڕەوادەران بوو. لە بیروڕادا پەروەردگاری جیهانیان پشتگیری بوو....

زۆر وا گوتراوە: (پێغەمبەر ﷺ هات ئەبوبەکر و عومەری دەگەڵ بوو) (پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت ئەبوبەکر و عومەری دەگەڵ بوو) (پێغەمبەر ﷺ غەزای کرد ئەبوبەکر و عومەری دەگەڵ بوو) ئەوانە هەموو لەو کارەساتە کەم دەکەنەوە کە چوك و دڵەکانی وەلەرزە خست. هەرچەند هەستکردن بە بۆشایی لەو جۆرە هەڵوێستانەدا سنوری چاکیەتی و خاوەن پایەتی دەبەزێنێ و دەبێتە هۆی پەشۆکان. کە دەستگرتن و زاڵ بوون بەسەریدا ئاسان نییە. لێرەدا ئەو پیاوانەی لە سێبەری پێغەمبەریتی پەروەردە ببوون. لەهەموو حاڵەتێکدا ئادابی پێغەمبەریتی حوکمی لەسەر کردون. لە حاڵەتی ڕێککەوتن و ئیختیلاف و هەموو کاروبارێکی ژیاندا. ئەو ئادابانەش زامنن بۆ لادانی هەر مەترسییەکی چاوەنوڕ کراو و پاراستنی پەیام و پاسەوانی یەکێتی ئوممەت و ئاسان کردنی کاروبار بەو شێوەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بەڕێوە دەچوو. ڕاویەکان دەڵێن: (یەکێك هاتە لای ئەبوبەکر و عومەر گوتی: وا کۆمەڵی یارمەتیدەران دەگەڵ سەعدی کوری عبادە[ر] لە بنمیچی بەرەی ساعیدەن و خۆیان داوەتە لای ئەو. ئەگەر پەرۆشی کاروباری خەڵکن بگەنێ پێش ئەوەی کار لە کارەگا بترازێ).

ئەو هەواڵە بەم دوو پێشەوایە گەیشت و پێغەمبەر ﷺ هێشتا ئامادە نەکراوە و نەنێژراوە. عومەر دەڵێ: بە ئەبوبەکرم گوت: با دەرچین بۆ لای یارمەتیدەرەکانمان تا بزانین ئەوە بە تەمای چین. با گوێ بگرین پێشەوامان عومەر باقی ڕوداو بگێڕێتەوە، دەفەرموێ:... یارمەتیدەران سەرپێچیان کردین و لە بنمیچی بەرەی ساعیدە کوبونەوەیان بە گەورەکانیان کرد، دەرچوین پێشیان بگرین تا بە دوو پیاو چاك -لە خۆیان- گەیشتین، بۆیان باسکردین ئەو کۆمەڵە لەسەرچی کۆبونەتەوە.

گوتیان: ئەی كۆمەڵی كۆچكردوان نیازی كوێتان هەیە؟ گوتمان: برایانی یارمەتیدەرمان دەوێن. گوتیان: پێویست ناكا لێیان نزیك مەبنەوە و كاری خۆتان بكەن. گوتم: وەڵلاهی دەچینە لایان. دەرچووین تاكو لە بنمیچی بەرەی ساعدە پێیان گەیشتین. بینیمان پیاوێكی داپۆشراو لە بەردەمیانە. گوتم: ئەم پیاوە كێیە؟ گوتیان سەعدی كوڕی عبادەیە. گوتم چییەتی؟ گوتیان نەخۆشە. كاتی دانیشتین گوێ لە وتاربێژەكەیان بگرین... پاشان باسی چاكە و تێكۆشانی یارمەتیدەرانی كرد و ئاماژەی بۆ ئەوە تێدابوو كە ئەوان بۆ جێنشینی پێغەمبەر ﷺ لە خەڵكیتر لە پێشترن.

لێرەدا پێویستی بە ئیستێك هەیە: یارمەتیدەران خەڵكی شارەكەن و ئەوان تێیدا -وەك ئەمرۆ دەڵێن- زۆرینەی رەهان، ئەوان حەوێنەر و سەرخەربوون، بە مال و باوڕ ئامادە بوون و دڵیان بەر لە ماڵیان بۆ ئیسلام كردەوە. لە كۆچكردوان كەسی نەبوو مەگەر برایەكی لە یارمەتیدەران چاكەی بەسەرییەوە نەبێ. ئەگەر دەربارەی جێنشینی دەقێكی یەكلاكەرەوەی قورئان یان سوننەت هەبوایە كارەكە بە باسكردن و حوكم پێكردنی كۆتایی دەهات و خیلاف نەدەما. بەڵام هیچ شتێك لەو بارەوە نەبوو. هیچ نەما تەنیا خۆ نواندن نەبێ بە هەموو خەسڵەتێكی حیكمەتی و كارزانی و ئەدەبی ئیختیلاف و گوتوبێژی ژیرانە و هێمنی راگیر لەسەر ووروژاندنی بەرزترین و چاكترین هەست لای هەردوو بەرە، بۆ رزگاربوون لە كوسپ و دەستگرتن بەسەر قەیران و دەرچوون لێی. ئەوەیە كە پێشەوامان عومەر دەفەرموێ: كاتی وتاربێژی یارمەتیدەران بێدەنگ بوو، ویستم بێمە قسە، وتەیەكم دەدڵدا ساز و ئامادەكرد پێم باش بوو بیڵێم، ئەبوبەكر گوتی: ئەی عومەر لەسەرخۆبە. حەزم نەكرد بێ دڵی بكەم. هاتە قسە، ئەو لەمن زاناتر و زاگوتر بوو. جا وەڵلاهی وشەیەكی بەجێ نەهێشت لە باشترینی ئەوەی من پێم باش بوو مەگەر لەسەرەتاوە ئەو یان وێنەی ئەو

یان چاکتر لەویان نەلێ، تاکو بێدەنگ بوو. لە وتەکانیدا گوتی: (لەو چاکانەی خوتان باستان کرد، ئیوە شایستە ترن پێی) پەسنی دان. بەوەی کە پیشکەشی دین و برا کوچکردوەکانیان کردوە، باسی ئەو چاکەو تیکوشانەی کردن کە وتاربێژەکەیان باسی نەکردبوو. پاشان دەستی کرد بە لادانی باس لەو ریرەوەی کە وتاربێژی یارمەتیدەران گرتبویەبەر. کارەکە تەنیا تایبەت بە مەدینە نییە، بەڵکو دورگەی عەرەبی ئەمروکە -هەموی- دەکەویتە ژێر سیبەری ئیسلام. ئەگەر کوچکردوانی دانیشتووی مەدینە بتوانن جینشینی تەسلیمی برا یارمەتیدەرەکان بکەن و چاکەیان لەبەر چاو بی، ئەوە باقی عەرەبەکان تەسلیمی غەیری قورەیش نابن. تاکو وتەشمان یەك نەبی، ئەوا پەیامی ئیسلام سنور نابەزینی و لە دەرەوەی دورگە بلاونابیتەوە. کەواتە بەرژەوەندی بانگەواز وا پێویست دەکات کە جینشینی لە قورەیش بی بۆ بەردەوامی پەیام و یەکبونی وتە و کوبونەوەی دڵەکان و بەردەوامی کشانی ئیسلامی. پاشان سەرپشکی کردن لە نیوان دووکەسی قورەیشی، کەسیش لەمەجرەی لە چاکەی هیچ کامیان نەبوو، عومەر و ئەبا عبیدە، خوشی لە کارەکە دەرهاویشت.

پیشەوامان عومەر دەڵی: (هیچم پێی ناخوش نەبوو لەوەی گوتی تەنیا ئەوە نەبی، واتە: تەنیا پالاوتنی عومەر و ئەبا عبیدە. وەڵلاهی ئەگەر بمدەنە پیش بۆ ئەوەی لە گەردنم بدری، بەلام ئەوە نزیکم نەکاتەوە لە تاوان، لام خوشترە لەوەی کە فەرمانرەوای گەلیك بم ئەبوبەکریان تیدابی...)

پاشان وتاربیژێکیتر لە یارمەتیدەران هەڵسا ویستی کارەکە بگیریتەوە ئەو ریرەوەی کە وتاربیژی یەکەم گرتبویە بەر. گوتی: (ئەی کومەڵی قورەیش با میریك لە ئیمە و میریك لە ئیوە بی) عومەر دەڵی: ( غەڵبەغەڵب زور بوو، دەنگ بەرز بووە

تا مەترسی ئیختیلاف کرا)[26] گوتم: (ئەی ئەبوبەکر دەستت بینە. دەستی هیناو بەیعەتم پی‌ی‌دا، پاشان کۆچکردوان و دوای ئەوان یارمەتیدەرانیش بەیعەتیان پی‌ی‌دا)[27] زۆر نەمابوو سەعدی کوری عبادە پالاوتەی یارمەتیدەران ﷺ لەبەر جمەهاتنی خەلکی بکوژری (خەلك هروژمیان برد بو بەیعەت دان بە ئەبوبەکر تاکو زۆر نەما سەعد پان کەنەوە بی ئەوەی هۆشیان لی‌بی).[28]

بەم شیوەیە هاوەلان ﷺ توانیان ئەو ناکوکی‌یە یەکلاکەنەوە بی ئەوەی پاشماوەی رق و قین لە دەرونیان بمینی. موسولمانان یەکدەنگ بوون بو دریژەدان بە پەیامی هەق و بلاوکردنەوەی تا ئەو شوینەی کە خودا مەیلی لی‌یەتی.

## ٤. ئیختیلافی هاوەلان لەسەر کوشتاری زەکات نەدەران:

ئەو کارە چوارەمین کاری ترسناك بوو کە هاوەلان تییدا ئیختیلافیان بوو. بە خونواندن بە نیەت پاکی هاوشانی ئەدەبی ئیختیلاف توانیان بەسەری دا زال بن. دوای ئەوەی بەیعەتی جینشینی پاش وەفاتی پیغەمبەر ﷺ بە ئەبوبەکر درا، هەندیك هۆزی تازە موسولمان لی‌ی هەلگەرانەوە و هەندیك دوای ئەوانە کەوتن کە داوای پیغەمبەریتیان دەکرد، وەك: موسەیلەمەی درۆزن و کەسانی‌تر. هەروەها هەندیك هۆزیش سەرپیچی‌یان لە نویژکردن و زەکات دان کرد، هەندیکیش تەنیا لە زەکات دان. سەرپیچی هەندیکیان لە نەدانی زەکات بە هوی نەفس بەرزی و خو بەزل زانی بوو لەوەی زەکات بە ئەبوبەکر ؓ بدەن. شەیتان بە تەئویلی گەندەل خستیە دلی هەندیکیان، چونکە وا گومانیان برد کە لە ئەسلی شەریعەت دا زەکات بە غەیری پیغەمبەر ﷺ نادری. چونکە ئەو فەرمان پیدراوە بە وەرگرتنی و پاداشدانیان لەسەری بە پاك و خاوین بوونەوە و دوعا کردن بویان بە پی‌ی ئەو فەرمودەیەی

٢٦ مەبەستی کیشەو دووبەرەکی‌یە.

٢٧ بنورە سیرة ابن هشام (٢/٦٥٦ - ٦٦١).

٢٨ سەرچاوەی پیشو.

خودای بەرز: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ التوبة: ١٠٣.

زەكات نەدەران لە بیریان چوو بوو یان لەبیری خویان بردبوو کە ئەو فەرمانە تەنیا تایبەت نییە بە پێغەمبەر ﷺ بەڵكو بو ئەوانەشە کە دوای ئەو کار دەگرنە دەست. چونکە فەرسان بو پێغەمبەرە بە سیفەتی ئەوەی فەرمان رەوا و پێشەوای موسوڵمانانە. زەكات وەرگرتن لە خاوەن ماڵ و تەسلیم کردنی بە موستەحەقان لەو کارانەی نێو بازنەی رێكخستنی كومەڵ و بەرێوەبردنیەتی وەك بەرپاكردنی حدودەكانی شەرع و شتیتر، دوای پێغەمبەر بەرپرسیتی دەگوازرێتەوە بو ئەوانەی بە نوینەریتی ئوممەت کاری موسوڵمانان رادەپەرینن.

هەر موسوڵمانی بەیعەتی دابا بە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بەیعەتی لەسەر دەدا نوێژ کردن و زەكات دان بوو، بە شیوەیەك هیچ جیاوازیەك لە نیوانیان دا نەبوو. جینشینی یەکەم، ئەبوبەکری صدیق بو رشت بوون لەسەر بەردەوامی رێرەوی ئیسلام بریاری کوشتنیانی دا تا ناچاریان بکا بو توبە و زەكات دان و گەرانەوە بو کومەڵگەی ئیسلامی و پابەند بوون بە هەموو ئەوەی بەیعەتیان لەسەر داوەتە پێغەمبەر ﷺ[29] بەرامبەر ئەو هەڵویستەی جینشینی یەکەم گرتیە بەر. ناکوکی دەکەویتە نیوان ئەو و عومەر ؓ کە هەر لەسەرەتاوە رای بەرەوا نەبوونی کوشتاری زەكات نەدەران دا.

ابو هريرە ؓ دەڵی: کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، سەردەمی ئەبوبەکر ؓ هەندیك عەرەب هەڵگەرانەوە. عومەر گوتی: چون کوشتاری خەڵکیك دەکەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (امرت ان اقاتل الناس حتى يقولوا: لا اله الا الله. فمن قاله

---

29 بگەرێوە بو البخاري بە پەراویزی الفتح (٣/٢١٢).

فقد عصم مني ماله و نفسه الا بحقها و حسابه على الله تعالى) واته: (فەرمانم پێدراوە كوشتاری خەڵك بكەم تاكو دەڵێن: لا اله الا الله، هەر كەس گوتی ئەوە ماڵ و گیانی لەمن پارێزرا و دەبێ تەنیا بە مافی خۆی نەبێ و لێپرسینەوەش لەسەر خودای گەورەیە).

ئەبوبەكر فەرمووی: (وەڵلاهی كوشتاری ئەو كەسە دەكەم جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەكات، زەكات هەقە لەسەر ماڵ، وەڵلاهی ئەگەر لەوەی داویانەتە پێغەمبەر ﷺ كارێنەیەكی كەم بێ نەسەرنەدانی كوشتاریان دەكەم. عومەر دەڵێ: (وەڵلاهی ئەوە شتێك نی‌یە مەگەر تەنیا خودا سینگی ئەبوبەكری بۆ كوشتار گوشاد كردبێ جا زانیم لەسەر هەقە)[30] كوری زید دەڵێ: (نوێژ و زەكات -پێكەوە- واجب كران، جیاوازیان لە نێوان دا نەكرا، ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾ التوبة: ١١ گوتی: رەحمەتی خودا لە ئەبوبەكر بێ چەند شارەزا بوو، رازی نەبوو نوێژ بێ زەكات وەربگیرێ، مەبەستی لەوە رشت بونیەتی لەسەر كوشتاری ئەوانەی جیاوازی دەخەنە نێوان نوێژ و زەكات)[31] هۆی خیلافی نێوان ئەبوبەكر و عومەر ﷺ ئەوە بوو كە پێشەوا عومەر و ئەوانەی دەگەڵی بوون دەستیان بە رواڵەتی فەرمودەكە گرتبوو. وایان دانابوو تەنیا بە موسوڵمان بوونی مروڤ، بە دەربڕینی شایەتمان، خوێن و ماڵی پارێزراو و كوشتاری حەرام دەبێ. بەڵام ئەبوبەكر ﷺ دەستی گرتبوو بە گوتەی (تەنیا بە مافی خۆی نەبێ) زەكاتیشی بە مافی ماڵ داناوە كە بە سەرپێچی كردن لە نەدانی مافی پاراستنی گیان و ماڵ نامێنێ. هەروەك لە پێكەوە هاتنی نوێژ و زەكات لە زۆربەی ئایەتەكانی

---

٣٠ سەرچاوەی پێشوو (٣/٢١١).

٣١ تەفسیری تەبری (١٠/٦٢)

قورئـان و فـەرموودەكانی پـێغەمبـەر ﷺ تێگەیشـتبوو كـە ئـەو دووانـە چـوون یـەكن جیاوازیان لە نێوان دا نییە.

مادامەكێ ڕێكەوتون لەسەر ئەوەی نوێژ نەكردن بەڵگەی هەڵگەڕانەوە و شـوێن كەوتنی ئەوانەیە كە داوای پێغەمبەرێتی دەكەن، ئەوا مل پێچی لە زەكاتیش دەبێ بـە بەڵگەی هەڵگەڕانەوە دابنرێ و كوشـتاری بكـرێ. بـەم جـۆرە ئەبوبـەكر ﷺ توانـی قەناعەت بە باقی هاوەڵان بێنی بەراستی ئیجتهادی لە واجبی كوشـتاری زەكـات نەدەران[٢٢] بە هەڵگەڕاوەی دانان ئەگەر تۆبە نەكەن و نوێژ نەكەن و زەكات نەدەن. بەو شێوەیە خیلاف لەو مەسەلە ئاڵۆزە نەما و لەسەر كوشتاری زەكات نەدەران هـاودەنگ بوون. هـەروەك لەسـەر كوشـتاری ئەوانـەی بـە تـەواوی هەڵگەڕانـەوە، ڕێككـەوتن بـۆ پاراستنی ئیسلام، لە هەوڵی بی هودە و هێرش هێنرانە سەری و پایە پایە ڕمـاندنی، پاش ئەوەی هیوا براوبوون لەوەی بە یەكجاری لە نێوی بەرن، ئەگەر ئەو هەڵوێسـتەی ئەبوبەكر پاشان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نەبوایە، بناغەی ئیسلام ڕانەدەگیرا و هەر لـە مەككـە و مەدینـە پـەنگی دەدایـەوە، هەڵگەڕانـەوە و ئـاژاوە سـەرتاپای دووركـەی دەگرتەوە.[٢٣]

## ٥. ئیختیلافی هاوەڵان لە هەندێك مەسەلەی فیقهیدا:

ئەگەر واز لە باسی كارە ترسناكەكان بێنین كە كونترۆل كران، باسـی شتـیتر بكەین دەبینین كـە سەرسامی لە ئەدەبی ئیختیـلاف و بەگەورە زانینـی زانایان لای یـەكتری تێیـاندا كۆتـایی نایـە، ئـەوەی كـە ئەبوبـەكر و عومـەر ﷺ ئیختیلافیـان لێ هەبوو، جیا لـەوەی باسمـان كرد... تـالان كردنـی هەڵگـەڕاوەكان بوو، ئەبوبـەكر ڕای

---

٢٢ واچاكە بنوڕیە درێژەی گوتوبێژی ئەبوبـەكر و عومـەر (رضـي الله عنهمـا) و درێـژەی گوتـەی زانایان لەو بارەوە لە نیل الاوطار، باب الحث على الزكاة والتشدد في معها (٤/١٧٥) و دوای ئەو.

٢٢ بۆ ئەوە و درێژی ڕوداو بگەڕێوە بۆ كتێبی مێژوویی وەك البداية والنهاية (٦/٣١١) و دوای ئەو.

بەتالآن بردنـی ژنـانی هەڵگەراوەکان بـوو پێچەوانـەی رای عومـەر کـە لەسـەردەمی جێنشینی خۆی لەو مەسەلەیەدا حوکمی ئەبوبەکری هەڵوەشاندەوە، ئازادی کردن و گێرانیەوە بۆ کەس و کاریان تەنیا ئەوانە نەبێ کە منداڵیان لە گەورەکانیان هەبوو، دەنێویاندا خەولەی کچی جەعفەری حەنەفی (دایکی موحەممەد کوری عەلی) بوو ﷺ.

هـەروەك ئیختیلافیـان هـەبوو لـە دابەشـکردنی ئـەو زەویانـەی فـەتح دەکـران، ئەبوبەکر ﷺ رای لەسەر دابەشکردنیان بـوو، بـەڵام عومـەر ﷺ رای لەسـەر وەقـف کردنیـان بـوو و دابەشـی نـەدەکرد. هـەروەها ئیختیلافیـان هـەبوو لـە پلـە جیـایی (المفاضلة) لە بەخشیندا، ئەبوبەکر رای بەیەکسانی بەخشین بوو، کەچی عومەر لەشت بەخشین بە موسوڵمانەکان پلە جیایی بەکار دەهێنا.

ئەبوبەکر ﷺ عومەری بە جێنشینی خۆی دانا، بەڵام عومەر ﷺ کەسی دانـەنا، هـەروەك لـە زۆر مەسـەلەی فیقهـی ئیختیلافیـان لـە نێـوان دا هـەبوو،[٢٤] بـەڵام ئـەو ئیختیلافانە هیچیان نەدەخستە سـەر برایـەتیان تـەنیا خۆشەویستـی نـەبێ. کـاتێ ئەبوبەکر عومـەری بەجێنشینی خۆی دانا هـەندێك لـە موسـوڵمانان پێیـان گـوت: (وەڵامـت بـۆ پـەروەردگار چدەبـێ ئەگـەر لێی پرسـیت دەربـارەی دانـانی عومـەر بەجێنشین لەسەرمان، لە کاتێ کە دەزانی عومەر توند و تیژە؟ فـەرمووی: دەڵێـم خودایە چاکترینی پیاوانی تۆم کردۆتە جێنشینی خۆم).[٣٥]

لەو کاتـەی یەکێك لە هاوەڵان بە عومەری گوت: (تـۆ لـە ئەبوبـەکر چاکـتری، عومـەر لە تورەیی گریا و فـەرمووی: وەڵڵاهـی تاکە شـەوێکی ئەبوبـەکر لە عومـەر و کەس و کاری عومەر خێرترە).[٣٦]

---

٢٤ بنوره الاحكام (٦/٧٦).

٣٥ بنوره طبقات ابن سعد (٣/١٩٩) و الكامل (٢/٢٩٢).

٣٦ بنوره حياة الصحابة (١/٦٤٦).

ئەوە نمونەی ئیختیلافی نیوان ئەو دوو پیاو چاکە بوو. هەرچەندە رایان جیاواز بوو، بەلام دلیان جیاواز نەبوو، چونکە بەندی دلیان بە سروشتی ئاسمانەوە پەیوەست درابوو، خاك و خۆلی زەوی دەسەلاتی بەسەریان دا نەبوو.

## ئەدەبی نێوان عومەر و عەلی

لە نیوان عومەر و عەلی ﷺ هەندیك جیاوازی هەبوو، بەلام لەسنووری ئەدەبێکی بەرزدا، جاریك عومەر ﷺ بە دوای ژنیکیدا نارد (میردی لە سەفەر بوو). پیاوانیك دەچوونە لای ئەویش نکولی دەکرد. پییان گوت بە دەنگی عومەرەوە بچو. گوتی هاوار لە خۆم عومەر چی بەسەرمەوەیە؟ لەو کاتەی لە ریگە دا بۆ لای عومەر دەچوو ترسا و ژان گرتی، رویشتە مالیك و منداڵەکەی دانا، منداڵەکە دووجار دەنگی لیبەرزبووە و پاشان مرد. عومەر ﷺ راوێژی بەهاوەلانی پیغەمبەر ﷺ کرد، هەندیکیان رایان بۆدا کە تۆ هیچت لەسەر نییە، تۆ تەنیا فەرمانبەر و پەروەردەکاری. عەلی ﷺ دەنگی نەکرد. عومەر ﷺ رووی تێ کرد و فەرمووی: چ دەلێی؟ عەلی فەرمووی: ئەمەی هاوەلان گوتیان ئەگەر رای خۆیان بێ ئەوا راکەیان هەلەیە، ئەگەر لەبەر دلی تۆش گوتیان ئەوا ئامۆژگاری تەواویان نەکردوی. من پیم وایە خوین باییت لەسەرە، چونکە تۆ ترساندت، منداڵەکەی بە هۆی تۆوە دانا. عومەر ﷺ فەرمانی دا خوین بایی منداڵەکە دابەش بکرێ و لە هۆزی خۆی (قورەیش) وەربگیرێ[37]. بەم شێوەیە عومەر ﷺ هاتە سەر رای عەلی ﷺ بەکەمایەسی نەزانی حوکم بە ئیجتهادی عەلی بکا کە خۆیشی میری باوەردارانە. گەرچی بەرای غەیری عەلی ﷺ لە خوین بایی رزگاری دەبوو.

---

۳۷ مسلم لە: باب (دية الجنين) ژمارە (١٦٨٢) و ابوداود و نسائي و ابن حبان و هیتریش ئەو باسەیان هیناوە. بنوڕە: لێدوانی ئیمە لە: المحصول (٢/ق١/٧٦) و (ق٢/٣٧٧).

# ئەدەبی نێوان عومەر و عەبدوڵڵای کوری مەسعود

لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵڵای کوری مەسعود چاکترین قورئان خوێن بوو، لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ زاناترینیان بوو، هەتا زۆربەی هاوەڵان لەبەر زۆری هاموشۆکردنی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بە ئەهلی بەیتی دەژمێرن. ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێ: (ماوەیەك بوو کوری مەسعود و دایکیمان نەدەبینی مەگەر لای ئەهلی بەیتی پێغەمبەر ﷺ[38] نەبا) ئەبو مەسعودی بەدری کە عەبدوڵڵای کوری مەسعود بەرەو رووی دێ، ئاماژەی بۆ دەکا و دەڵێ: (نەمزانیوە پێغەمبەر ﷺ کەسی لە دوای خۆی جێهێشتبێ زاناتر بێ بەوەی خودا دایبەزاندوە، لەو کەسەی بەرەو ئێرە دێ. ئەبو موسا دەڵێ: ئێمە لای پێغەمبەر ﷺ دیار نەبایەن ئەو دیار دەبوو ئێمە رادەگیراین ئەو رێگەی دەدرا بچێتە ژوور)[39] عومەر ﷺ بە شارەزا لە فیقه و بەرزی رێز ناسرابوو، کوری مەسعود لە هەندێك کاردا یەکێك بوو لە قوتابیانی عومەر ﷺ. لە زۆر لە ئیجتهادەکانی هاورای عومەر بوو. تەنانەت مێژونوسانی شەریعەتی ئیسلامی وایان داناوە کە عەبدوڵڵا لەهەموو هاوەڵان زیاتر لە ژێر کاریگەری عومەر بووە. لە زۆربەی ئیجتهادەکان و رێگەکانی بەڵگەسازی هاورابوون. عەبدوڵڵا لە هەندێك مەسەلەی فیقهی بۆ رای عومەر ﷺ گەراوەتەوە. هەروەك لە دانی بەشی باپیر لە میرات (مقاسمە) دەگەڵ خوشك و برایان جارێك بۆ سێ یەك و جارێکیش بۆ شەش یەك.[40]

---

٣٨ مسلم هیناویەتی و بنوره: الاحكام لابن حزم (٦/٦٣).

٣٩ مسلم هیناویەتی و بنوره: الاحكام لابن حزم (٦/٦٣).

٤٠ بنوره الاحكام (١/٦١) و بيان المسألة.

بەلام لە زور مەسەلەیتر جیاوازیان هەبوە. لەوانە:

کوری مەسعود ﷺ لە رکوع دا دەستی لە نیوان رانی جوت دەکرد و نەهی دەکرد لە دانانی لەسەر ئەژنو. بەلام عومەر نەهی لە یەکەم دەکرد و ئەوەی دوەمیشی دەکرد.

کوری مەسعود رای وابوو ئەگەر پیاو بە ژنەکەی بلی: (تو لەمن حەرامی) ئەوە سویندە، عومەر دەلی (ئەوە هەر یەك تەلاقە).

کوری مەسعود ﷺ دەلی: (پیاویك زینا دەگەل ژنیك بکا پاشان بیهینی، هەر کات کوببنەوە لە زینا دان، عومەر رای وا نەبوو. یەکەمیان بە زینا و ئەویتر بە مارەیی دادەنی).[41]

ابن القیم لە (اعلام الموقعین)دا ئەو مەسەلە فیقهیانەی هیناوەتەوە کە تییدا کوری مەسعود موخالەفەی عومەری کردوە ﷺ گەیشتوتە سەد مەسەلە چواریانی باسکردوە.[42]

دەگەل ئەو جیاوازیانەش دا خوشەویستیان بەرامبەر یەکتری کەمی نەکرد و ریزو دوستایەتی هیچ کامیان بو ئەویتر لاواز نەبوو. دوو کەس هاتنە لای کوری مەسعود یەکیان لەسەر شیوازی عومەر ﷺ قورئانی خویندەوە. ئەویتر لەسەر شیوازی هاوەلیکیتر. ئەوەی یەکەم دەلی: عومەری کوری خەتاب پیی خویندومەتەوە. کوری مەسعود ﷺ لە تاوان دەگریی تاکو بە فرمیسکەکانی چەوی (زەوی) تەردەکا و دەلی: بخوینەوە وەك عومەر پیی خویندویەتیەوە، عومەر ﷺ بو ئیسلام قەلایەکی پولایین بوو، خەلك دەچوونە ناوی و لی نەدەهاتنە دەر. هەرکە عومەر پیکرا قەلا کەلینی تیکەوت.[43] روژیك عومەر ﷺ دانیشتبوو دەبینی وا

---

٤١ سەرچاوەی پیشو

٤٢ بنورە اعلام الموقعین (٢/٢١٨).

٤٣ بنورە الاحکام (٦/٦١).

کوری مەسعود بۆ لای دێ دەڵێ: (جامێکە پڕ بووە لە فیقھ و زانست) لە ریوایەتێکیتردا: (جامێکی پڕ لە زانست بوو، خەڵکی قادسیە شانازیان پێ‌ی دەکرد).[44]

عومەر ﷺ ئاوا بو کوری مەسعودی دەنواری، جیاوازی نیوانیان لەو مەسەلانە لە هیچی زیاد نەکرد تەنیا خۆشەویستی و ڕێز نەبێ.

پێویستە ئێمە ئادابگەلی لەو رووداوانە هەڵێنجین و بیکەینە ڕێرونی‌یەك بۆ چارەسەری کێشە خیلافیەکانمان.

## ئەدەبی نێوان کوڕی عەباس و زەیدی کوڕی ثابت

تاکو زیتر بە ئەدەبی ئیختیلافی نیوان هاوەلان ﷺ ئاشنا بین، وا چەند کێشەی خیلافی نیوانیان دەخەینە روو، دەڵێین: کوری عەباس ﷺ وەك ئەبوبەکر و زۆر لە هاوەلان ﷺ رای وایە کە باپیر وەك باوك هەموو براو خوشکان لە میرات بێ بەش دەکا. زەیدی کوری ثابت وەك عەلی و کوری مەسعود و دەستەیەك لە هاوەلان ﷺ رای وایە خوشك و برا دەگەڵ باپیر میرات وەردەگرن و بێبەش نابن پێ‌ی. جارێك کوری عەباس ﷺ دەڵێ: زەید لە خودا ناترسێ، کوری کور وەك کور دادەنێ، کەچی باوکی باوك وەك باوك دانانێ! پێم خۆش بوو ئەوانەی لە دابەشکردنی میرات دا موخالیفی منن کوببینەوە و دەستمان لەسەر ئەسڵی مەبەست دابنێین و پاشان موباهەلە بکەین و لەعنەتی خودا لە درۆزنان بکەین.[45]

ئەوە نمونەی ئیختیلافی فیقهی هاوەلان بوو، بۆ ڕۆچوونە چاڵ و بە ئەسڵ بینینی ئیختیلاف نایهێنینەوە، بەڵکو بۆ کورت هەڵێنانی ئەوەی لێمان ون بووە و بۆ

---

٤٤ طبقات ابن سعد (١٦١/٤) و حياة الصحابة (٧٩١/٣).

٤٥ بۆ ئەو باسەی هیناومانە بگەرێوە بۆ کتێبی: الآثار لحاشيتنا علي - المحصول - (٢/ق٢/٧٦) و (٢/ق١/١٨١).

پیداچونەوەی ئادابگەلێ تا بۆ چارەسەری خیلافە فیقهیەکانمان لەسەری یەکبگرینەوە و نە مامەڵەمان دەگەڵ خەڵك ببێتە شێوازی ژیانمان. کوری عەباس ﷺ کە متمانەی بە راستی ئیجتهادی خۆی و ناراستی ئیجتهادی زەید ﷺ گەیشتبوە ئەو ئاستەی کە زانیمان، کەچی رۆژێك دەبینێ وا زەید سواری ولاخەکەی دەبێ، جڵەوی ولاخەکەی دەگرێ تا بۆی راکێشێ، زەید دەڵێ: خۆت لادە ئەی کوری مامی پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەڵێ: فەرمانم پێدراوە ئاوا ریزی زانا و گەورەکانمان بگرین. زەید ﷺ دەڵێ: دەستتم نیشان بدە. کوری عەباس ﷺ دەستی دەردەهێنێ، زەید ماچی دەکاو دەڵێ: فەرمانمان پێدراوە ئاوابکەین بۆ ئەهلی بەیتی پێغەمبەرمان ﷺ[46] کاتێکیش زەید وەفاتی کرد کوری عەباس ﷺ گوتی: (بەم جۆرە زانست دەروا)[47] لە ریوایەتی بەیهەقی لە (سننه الکبری) دا دەڵێ: (بەم جۆرەیە رۆیشتنی زانست، ئەمرۆ زانستێکی زۆر نێژرا)[48] عومەر ﷺ بۆ مەسەلە ترسناك و پڕ گرفتەکان کوری عەباسی دەگەڵ کۆچکردوان و یارمەتیدەران لە هاوەڵانی بەدر و هاوەڵانیتریش، بانگ دەکرد.[49]

بەراستی ئەگەر هەوڵدەین وەدوای کێشە خیلافیەکانی نێوان هاوەڵان لە مەسەلەکانی فیقهی و رەفتاریان لە خستنە روی بیروڕایان بکەوین، ئەوا چەندین کتێب رەشنوس دەکەین، لێرەش دا مەبەستمان ئەوەنییە، بەلام تەنیا چەند نمونەیەك دێنینەوە، بۆ بەڵگە لەسەر چەندێتی پابەندبوونی هاوەڵان بە ئەدەبی

---

٤٦ کنز العمال (٣٧/٧) و (حیاة الصحابة) (٣٠/٣) تێیدا بنۆرە راستکراوەکانی و باقی سەرچاوەکانی.

٤٧ بنۆرە اعلام الموقعین (١٨/١).

٤٨ سنن البیهقي (٢١١/٦) و المحصول (٢/ق٢/٧٧).

٤٩ مصنف عبدالرزاق (٢٨/١١) ژمارە (٣٠٤٨٩) والمحصول (٢/ق١/٢١٧) و دوای ئەو.

ئیختیلاف لە هەموو باروودوخێکدا. لەو ئادابانە دەدوێین کە چینی هاوەڵانی لەسەر پەروەردە بوون.

کاتێ چارەنووس (بەوەی پێشتر لە زانستی خودا هەبوو) هات. ئاژاوە گەورەکان بەرپابوون و ئەوە لە نێوان هاوەڵان روویدا کە روویدا. کارێك بوو تەنیا خودا زانایە بە هەموو هوکارەکانی و ئاگادارە بە گشت لایەنەکانی. کە ئەوەش رویدا و شمشێر کەوتە نێوان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەچی چاکەی ئەوانەیان لە بیرنەکرد کە خاوەن چاکەن، کارەسات و ئاژاوەی گەورە پایەی خاوەن پایەکانی لە بیرنەبردنەوە.

ئەوەتا مەروانی کوری حەکەم دەربارەی میری باوەڕداران ئیمام عەلی (کرم الله وجه) دەڵێ: کەسم نەبینیوە لە زاڵ بوون دا لە عەلی بەرێزتر بێ، هەر ئەوە بوو لە شەری الجمل پشتمان هەڵکرد جارچییەکەی جاریدا هێرش نەکەنە سەر برینداران[٥٠] دوای شەری الجمل عمرانی کوری طلحة دەچێتە لای ئیمام علی ﷺ ئەویش بەخێرهاتنی دەکا و لە خۆی نزیك دەکاتەوە و دەفەرموێ: دەخوازم خودا من و باوکت لەوانە دابنێ کە دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾ الحجر: ٤٧ پاشان لەیەك بەیەکی بنەماڵەی طلحة و منداڵەکانی و دایکی منداڵەکانی دەپرسێ... ئەی برازا فلان چۆنە؟ ئەی فلان؟... هەندێك لە ئامادەبوان کە شەرەفی هاوڕێیەتی پێغەمبەریان پێ نەبڕابوو سەرسام دەبن، نەیاندەزانی هاوڕێیەتی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ مرۆڤ مانای چییە؟ دوو پیاوی دانیشتوو لە گۆشەیەکی رایەخەکە گوتیان: خودا لەوە دادگەرترە، دوێنێ کوشتارت کردن و لە بەهەشتیش دەبنە برای یەکتر؟ ئیمام عەلی تورە دەبێ و

٥٠ حیاة الصحابة (١٢/٣).

پێیان دەڵێ: (خودا بتان گرێ ئەگەر من و طلحة ئەو برایە نەبین لەبەهەشت ئەی دەبێ کێ بێ؟!).[51]

هەندێك دەربارەی ئەهلی الجمل لە ئیمام عەلی دەپرسن: ئایا ئەوانە موشریکن؟ ئیمام دەڵێ: لە شرك هەلاتوون. دەپرسن: ئایا مونافیقن؟ ئیمام دەڵێ: مونافیقان کەمێك نەبێ یادی خودا ناکەن. دەپرسن: ئەی ئەوانە کێن؟ ئیمام دەفەرموێ: برامانن دەستدرێژیان کردە سەرمان.[52]

یەکێك لای عەماری کوری یاسر بە خەراپی باسی عائشە (دایکی باوڕداران) ﷺ دەکا، عەمار (وەك دەزانین) لەشەری الجمل هەڵوێستی دژی عائشە ﷺ بوو دەڵێ: (بێدەنگبە دزێوی هەڵور. باسی خۆشەویستی پێغەمبەری خودا ﷺ دەکەیت؟ شایەتی دەدەم کە لە بەهەشت هاوسەری پێغەمبەری خودایە ﷺ. عائشەی دایکمان ﷺ رێرەوی خۆی گرت، ئێمە دڵنیان هاوسەری پێغەمبەرە ﷺ لە دونیا و دوارۆژ. بەڵام خودا بەو گیرۆدەی کردین تا دەرکەوێ مل کەچی خودا دەبین یا ملکەچی عائشە ﷺ.[53]

چ ئەدەبێك لەوە زیاتر چاوەنوڕ دەکرێ لەو پیاوانە هەبێ، کە خودا ویستی رەمەکانیان وێك بکەوێ. بەڵام ئەو نورەی لە چرای پێغەمبەرایەتی وەریان گرتبوو، هەردەم دڵەکانی رووناك دەکردنەوە و رق و قین نەیان دەتوانی دایان پوشێ. پڕ لە وێنەی ئەو ئەدەبی ئیختیلافە بوو. سوپاس بۆ خودا کە لە دەروونی پیاوانی سەدە چاکەکان ئیختیلاف و بێ رێزی پێکەوە کۆ نەکردبۆوە.

---

٥١ طبقات ابن سعد (٣/٢٢٤) و حياة الصحابة (٣/١٣).

٥٢ بە بیهقی لە سنن هیناویەتی (٨/١٧٢).

٥٣ سەرچاوەی پێشو و کنز العمال (٧/١٦٦) و حياة الصحابة (٣/١٤).

## ضرار وەسفی عەلی دەكا و معاویە دەگرییْ

ئەبو نەعیم لە ئەبو صالح هیناویەتی و دەلْیْ: ضراری كوری ضمرەی كنانی چووە لای معاویە، معاویە پـیْی گـوت: وەسـفی (عـەلی)م بـۆ بكـە. ضـرار گوتـی: نامبووری لەباس كردنی ئەی میری باورداران؟ گوتی: ناتبورم. ضرار دەلْیْ: كەواتە هەر دەبیْ باسی بكەم. وەڵلاهی عەلی دووربین بوو، هیزی بەتین بوو، گوتەی بنبر بوو، حوكمی بە داد دەكرد، زانست لە هـەموو لایەكی دەردەقولا، حیكمەت لـەملا و ئەولای دەباری. زەندەقی لە دونیا و زینەتی دونیا چوو بوو، هاورازی شەو و تاریكی شـەو بـوو، وەڵلاهـی فرمێسـكی بـە لێزمە دەهاتـە خـوار، زۆر فیكـری دەكـرد، لـەپی دەستی وەردەگیرا و نەفسی خۆی دەدواند، تا پۆشاك كورت و خۆراك وشك و بیْ تام با پـیْی خـۆش بـوو، وەڵلاهـی یـەكێك بـوو وەك ئیمە، كە دەچووینـە لای لیمـان نزیك دەبووە، پرسیارمان كردبا وەڵامی دەداینـەوە، ویرای نزیك بوونـەوەی بۆمـان و نزیكی لیمـان لەبـەر هەیبـەتی نـەمان دەدوانـد، ئەگـەر بـزەی دەهـاتیْ وەك مـرواری دانەدانـە بـوو، خاوەن دینـی بەگـەورە دەگـرت و هەژاریشـی خۆشدەویسـت. خـاوەن هیزی ناهەق لای ئەو زالْ نەدەبوو، بیْ هـیزیش لـە دادی نائومید نـەدەبوو. وەڵلاهـی شایەدی دەدەم لە هەندیك هەلْویستی بینیومە پەردەی شەو راكشاوە، ئەستیرەكانی ئاوابوون، لە میحرابەكەی دەماوە، ریشی دەگرتە نیو دەستی، ئارامی نەدەگرت، نـەك لەبـەر ناسـاغی (بیْ ئـارامی سـاغ - مـاران گـاز) دەگریـا گریـانیْكی غـەمناك، هـەروەك ئیستاكە گویـم لیبـیْ دەلْـیْ: ئـەی پـەروەردگارا، ئـەی پـەروەردگارا، خـۆی بـۆ زەلیـل دەكرد، دونیای دەدواند: ئایا بۆ من خرایە روو؟ ئایا بـۆ مـن رازایـەوە؟ (دەركـەوتـی) هـەیهوو... هـەیهوو. غـەیری مـن بخەلْەتینـە، سـیْ تەلاقـەم داوی، تەمـەنت كورتـە، مەجلیسیت چاوشۆرە، مەترسیت ئاسانە، ئای ئای، لە كەمی توێشو و دوری سـەفەر و هەترەشی ریْگا.

معاویە ئەم ئەم فرمێسكی دەرژایە سەر ریشی و پێی ڕانەدەگیرا، بە ئەنگوچکی دەیسریەوە. ئامادەبوانیش قورگیان پڕ لە گریان ببوو، معاویە دەڵێ: باوکی حەسەن (رەحمەتی خودای لێبێ) ئاوا بوو، ئەی ضرار غەمناکیت بۆی چۆنە؟ ضرار دەڵێ: وەك غەمناكی ئەو دایكەی تاقانەكەی دەكوژشیدا سەر بڕابێ و فرمێسكی نەوەستێ و نەبڕێ، خەمیشی ئارام نەگرێ. پاشان هەستا و رۆیشتە دەر.[٥٤]

## شەقڵی ئەدەبی ئیختیلاف لەسەردەمی خیلافەی راشیدین

لە میانەی خستنە رووی ئەو كێشانەی ئیختیلافیان لەسەرە تێبینی دەكەین كە هەوا و ئارەزو نەبۆتە خواستی هیچ یەك لە هاوەڵان ﷺ ئەو خیلافاتەش كە ئەو ئادابانەی لێ پەیدا دەبوو بێجگە لە گەران بە دوای هەق هیچیتر پاڵنەری نەبووە. وا لێرەدا چەند دڵۆپێك لەدەریای ئەدەبی ئیختیلافی نێوان هاوەڵان دوای سەردەمی پەیام و پچرانی سروش، دەخەینە بەر چاو:

١. هاوەڵان ئیختیلافیان خستبووە پەراوێزەوە، تێیدا تووشی غەم و نیگەرانی دەبوون، بە تەواوی رشت بوون لە سەر نەبوونی ئیختیلاف.

٢. كاتێ چەند هۆیەك دەبوونە پاساو بۆ بوونی خیلاف، وەك ئەوەی لە كارێكدا فەرموودەیەك بە یەكێكیان گەیشتووە و بەویتر نەگەیشتوە، یان ئیختیلافیان لە تێگەیشتنی دەق دەبوو، یا لە سنووری وتەیەك دا رادەوەستان و پەلەیان بۆ وەلامێكی راست بووە و دانیان بە هەڵەی خۆیان دا ناوە بێ ئەوەی هەست بەكەمایەتی بكەن. ئەوپەری رێزیشیان بۆ خاوەن فیقهـ و زانست و چاكە هەبووە هیچ كەسیان سنووری رێزی خۆی نەبەزاندووە. قینی لەراستی براكەی

---

٥٤ الحلية (٨٤/١) ابن عبدالبر یش لە الاستیعاب (٤٤/٣) لە الخرمازي پیاوێكی هەمەدانە لە ضرار الصدائي هاو واتای ئەمەی هێناوە.

نەبووە. هەموویان دەیانزانی کە بیرو را هاوبەشە. رەنگە هەق لەوەدا بێ کە خوی بۆی چووە، ئەوەش لەلای راستترە. یان رەنگە حەق لەوەدابێ کە براکەی بۆی چووە. ئەو کاتە ئەو بۆی دەگەڕێتەوە و بەرهەڵستیش نییە بەرگری بکا لەوەی گومانی وابووە کە راستە، کەچی وانەبووە. یان هیچ شتێکیش نییە بەرگری بکا لەوەی گومانی وابووە کە ناراستە، کەچی راست بووە.

٣. برایەتی ئیسلامی نێوانیان بنەرەتێکە لە بنەرەتە گرنگەکانی ئیسلام، کە ئیسلام بێ ئەو راگیر نابێ و برایەتیش لەسەرووی ناتەبایی یان تەبایی مەسەلە ئیجتهادی یەکانەوەیە.

٤. لە مەسەلە عەقیدەیی یەکان خیلاف وەری نەدەخرا، بەڵکو لە مەسەلە فەرعی یەکان تێ پەڕی نەدەکرد.

٥. هاوەڵان ﷺ پێش خەلافەتی عوسمان ﷺ لە مەدینە کۆهاتبوون، کەمێکیشیان لە مەککە بوون، تەنیا بۆ جیهاد و شتی لەو بابەتە بەجێیان دەهێشت، پاشان دەگەڕانەوە و بە ئاسانی پێک دەگەیشتن و لە زۆربەی کاروباردا هاو را دەبوون.

٦. قورئان خوێن و فەقیهە ناسراوەکان وەك سەرکردەی سیاسی دیاربوون، هەر یەکەیان شوێنپێی زانراوی خۆی هەبوو کە هیچ کەس لاملی تێیدا نەدەکرد. هەروەك بۆ هەموویان ناسراوی یەك هەبوو لەو لایەنە فیقهی یەی کە تێیدا شارەزایە، ئەمە و ڕوونی ڕێچکە و مەنهەجی هەڵێنجان و رایان لەسەری وە ڕێککەوتنێکی ناراستەوخۆ دەچوو.

٧. پێیان وابوو ئەو کەسەی هەست بە ناتەواوی رای بەرامبەر دەکا، ئەوە هاوکاری دەکا نەك عەیب و ڕەخنەی لێدەگری.

# خیلاف لەسەردەمی تابعین و ئادابەکەی

یەك لە سیاسەتەکانی میری باورداران عومەر ﷺ ئەوەبوو ریگای بە هاوەلانی کۆچکردە و یاریدەدەر نەدەدا لە دەرەوەی مەدینە نیشتەجێ بن. ئەوان بەردەوام لە دەرەوەی مەدینە بوون، سەفەریان دەکرد. بۆ غەزا یان فێرکردن یان والیەتی یان حاکمیەتی یان بۆ ئەرکیتر دەردەچوون، بەلام تەنیا مەدینە شوینگە و نشینگەیان بوو، چونکە مەدینە بنکەی دەولەت و خەلافەت بوو، ئەوانیش هەلگری پەیامی ئیسلام و پێشەنگی یەکەمن پێویستە هەردەم لە خەلیفەوە نزیك بن و هاوکاریی باری گرانی بن، لە هەموو کاروباری ئوممەت بەشداری دەگەل بکەن. کاتێ عوثمان ﷺ خەلافەتی گرتە دەست، بەلایەوە ئاسایی بوو ریگا بدا بەهەر کەسی لە هاوەلان کە بیەوێ مەدینە جێبیلێ و لەهەر شوێنێکی ولاتی ئیسلام نیشتەجێ بێ. ئەوە بوو هاوەلانی قورئان خوین و فەقیهـ پەرتەوازەی شوینە رزگارکراوەکان و شارە ناسراوەکان بوون.

زیاتر لە سێ سەد کەس لە هاوەلان نیشتەجێی هەردوو شاری (بەسرە و کوفە) بوون، ژمارەیەکیان لە مصر و شام گیرسانەوە.

دەگیرنەوە پاش ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە حنین گەرایەوە دوازدە هەزار هاوەلی لە مەدینە جێ هێشت. دە هەزاریان تاکو وەفاتی ﷺ لەوێ مانەوە. دوو هەزاریشیان بە شارەکاندا بلاوبوون.[55]

ئەو تابعیانەی بە هاوەلان گەیشتن دوای ئەوان بوونە هەلگری زانست و فیقهـ و خوینەری قورئان. وینەی: سەعیدی کوری موسەییەب[56] کە لە مەدینە بە راوی

---

55 الفكر السامي (١/٣١١).

56 سعيد بن السيب. گەورەترین و زاناترینی تابعیەکان بووە. لە سالی ١٥ ك لە دایك بووە و لە ٩٤ ك وەفاتی کردوە. سەرگوزەشتەی لە زور کتیب دا هەیە. وەك الطبقات الكبرى لابن سعد.

عومەر و هەڵگری فیقهەکەی دادەنرێ. عەتا کوری ئەبی رەباح لە مەککە، طـاووس لـە یەمەن، یەحیای کوری ابی کثیر لە یەمامە، حسن لە بصره، مکحول لە شام، عطاء لـە خوراسان، عەلقمە لە کوفە و چەندیتریش، ئەوانە زۆر جار لە بەر چاوی هـاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ فـەتوایان داوە و ئیجتهادیـان کردوە. لەبـەر چـاوی ئـەو هاوەڵانـەی کـە زانسـت و فیقهیان لێوەرگرتـوون و لەسـەر دەستی وان پـەروەردە و لـە ئـەدەبی وان فێرە ئەدەب بوون و لە هەڵێنجاندا کەوتنە ژێر کاریگەری مەنهەجی ئەوان.

کە ئیختیلافیشیان دەبـوو، لـە ئـادابی هـاوەڵان دەرنـەدەچوون و لـەو رێـرەوە تێیان نەدەپەراند، ئەوانە فقهای جمهورن کە جەماوەری ئوممەت پێیان دەنازن و فیقهیان لێ وەردەگرن. لەو دوو گوتوبێژەی ژێر و کە لە سەر خوێن بایی‌دا رویداوە، زیاتر ئەو ئادابە روون دەبێتەوە:

عبدالرزاق[٥٧] لە رێگەی شعبی‌یەوە هێناویەتی، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای شریح لە خوێن بایی پەنجەکانی پرسی. شریح گوتـی: بۆ هـەر پەنجەیەك دە حوشترە: کابرا گوتی سبحان الله. ئەمە و ئەوە یەکسانن (مەبەستی پەنجەی گەورە و بچووك بوو).

شریح گوتـی: مـاڵ کـاول، سوننەت قیاسـی قەدەغـە کـردوە، شـوێن سـوننەت بکەوە و شت دامەهێنە.

مالیك لە موطأ لە رەبیعەوە هێناویەتی، دەڵێ: لە (سەعیدی کوری موسەییەب)م پرسی: خوێن بایی پەنجەیەکی ئافرەت چەندە؟ گوتـی دە حوشـتر. گوتم: ئـەی دوو پەنجەی، گوتی بیست، گوتم: ئەی سێ پەنجەی؟ گوتـی: سی. گوتم: ئـەی چوار؟ گوتی: بیست. گوتم: لەو کاتەی برینی گەورەتر و کارەساتی ناخۆشتر دەبێ خوێن

---

(٥/١١٩-١٢٣) و خلاصة تذهيب الكمال (١٢١) و تهذيب التهذيب (٤/٨٤) وتقريب التهذيب (١/٣٠٥) والبداية (٩/٩٩) ژیان نامە و پلەوپایەی لـە زۆر کتێبـی کۆن و نوێدا بـە تایبەتی باسکراوە.

٥٧ المصنف والفكر السامي (١/٣٩١) ابن منذر هێناویەتی و سەنەدەکەی راستە.

بایی کەمتر دەکاتەوە! سەعید گوتی: تۆ ئێراقی؟ ڕەبیعە دەڵێ: گوتم: بەڵکو زانایەکی بەڵگە ویستم یان نەزانێکی فێرخوازم، سەعید گوتی: ئەی برازاکەم ئەوە سوننەتە.[58] کار لەو ئاستە کۆتایی دێ، بێ ئەوەی هیچ لایەك زیادە ڕەوی بکا و ئەویتر بە نەزانی تاوانبار کا. یان خۆی بە راست و ڕەوا و غەیری خۆی بە ناڕەوا بزانی.

لە مەزهەبی سەعید و حیجازیەکان خوێن بایی ئافرەت وەك خوێن بایی پیاوە تاکو دەگاتە سێیەکی خوێن بایی‌یەکەی، ئەگەر لە سێیەك تێپەڕی دەبێتە نیوەی خوێن بایی پیاو. ئەوەش بەو فەرمودەیەی عەمرو کوڕی شعیب لە باوکی و ئەویش لە باپیری‌یەوە هێناویەتی: (خوێن بایی ئافرەت وەك خوێن بایی پیاوە تاکو دەگاتە سێیەکی خوێن بایی‌یەکەی).[59]

بەڵام لە مەزهەبی ئێراقیەکان هەر لەسەرەتاوە خوێن بایی ئافرەت نیوەی خوێن بایی پیاوە. شەعبی (عامر کوڕی شراحیل الکوفی) لە سەر قیاس گوتوبێژی دەگەڵ پیاوێك کرد، پێی گوت: ئەگەر ئەحنەفی کوڕی قەیس و منداڵێکی بچووك پێکەوە کوژران، ئایا خوێن باییان یەکسانە یان هی ئەحنەف لەبەر عەقڵ و زانستەکەی پتر دەبێ؟ پیاوەکە دەڵێ: بەڵکو یەکسان دەبێ. شەعبی دەڵێ: کەواتە قیاس شتێك نی‌یە (تەواو نی‌یە). ئەوزاعی لە مەککە بە ابی حەنیفە دەگات و پێی دەڵێ: ئەوە بۆچی لە کاتی ڕکوع و ڕاستبونەوەی‌دا دەست بەرزناکەنەوە؟ ئەبو حەنیفە دەڵێ: شتێکی ڕاست لەو بارەوە لە پێغەمبەر ﷺ نەهاتوە.

ئەوزاعی دەڵێ: چۆن، زوهری بۆی باسکردم لە سالم و ئەویش لە باوکی‌یەوە هێناویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای نوێژ و ڕکوع و ڕاستبونەوەی‌دا دەستی

---

٥٨ الموطأ مع شرحه للزمراني (١٨٨/٤) ومصنف عبدالرزاق (٣٤٩/٩) وسنن البيهقي (٦٩/٨).

٥٩ النسائي (٥٤/٨) و الدار قطني (٣٦٤/٤).

بەرزكردوتەوە. ئەبو حەنیفەش دەڵێ: حماد لە ئیبراهیم و لە علقمە و ئەسوەد لە كوڕی مەسعودەوە هێناویانە: پێغەمبەر ﷺ تەنیا لەسەرەتای نوێژ دەستی بەرزكردوتەوە و چیتر دوبارەی نەكردوتەوە. ئەوزاعی دەڵێ: من دەڵێم زوهری لە سالم و لە باوكی‌یەوە هێناویەتی، تۆ دەڵێی حماد لە ئیبراهیمەوە بۆی باسكردوم؟

ئەبو حەنیفە دەڵێ: حماد لە زوهری فەقیهتربوو، ئیبراهیم لە سالم فەقیهتربوو، عەلقەمەش لە كوڕی عومەر ژیرتر نەبوو، گەر كوڕی عومەر فەزڵی هاوەڵایەتی پێغەمبەری ﷺ هەیە، ئەسوەدیش چاكەی زۆری هەیە، (عەبدوڵلا)ش (عەبدوڵلا)یە. ئەوزاعی بێدەنگ بوو.[60]

دەگێرنەوە ئەبو حەنیفە گوتویە: (ئەوەی كە ئێمە دەیڵێین رەئی‌یە، كەسیش ناچار ناكەین لەسەری، ناشڵێین: پێویستە لەسەر هەموكەس بە تۆبزی وەریگری، ئەوی شتی چاكتریشی لایە بابیهێنی).[61]

هەمویان شوێن كەوتەن، كاتی فەرمودە راست بوو كەس موخالەفەی ناكا، ئەگەر بیكاتیش ئەوە ئیختیلافە لە تێگەیشتنی فەرمودەكە. هەركەس ئەوەی تێ‌ی گەیشتوە تەسلیمی بەرامبەری دەكا، مادام وتەكە هەڵێدەگری و هیچ شتێك لە بەڵگەی تەواوی لای هەر دوو لایەن دژی ناوەستێ.

## شوێنەواری خیلافی سیاسی لە ئیختیلافاتی عەقیدەیی و فیقهی دا

لەو كارانەی پێویستە ئاماژەیان بۆ بكرێ، ئەوەیە كە ئەو ئیختیلافانەی باسمان كردن كاری زۆربەی زۆری جەماوەری ئوممەت بوو، بە جۆری ئیختیلاف لە كێشە فیقهی‌یەكان تێنەدەپەڕی، كە ئەوەش بە گەڕانەوە بۆ دەقەكانی قورئان و سوننەت

٦٠ الفكر السامي (١/٣٢٠).

٦١ الانتقاء (١٤٠).

(كە لە سەروی شوبهەكانن) نەدەماو لادەچو. هەمویان لە ژێر سیبەری ئەدەبی بەرزی پێغەمبەرێتی تەسلیمی هەق دەبون. چونکە هۆی ناکۆکی لەوە زیاتر نەبو (وەك گوتمان) نەگەیشتنی فەرمودە لە كارێك دا بە یەكێكیان و گەیشتنی بەویتریان. یان لە تێگەیشتنی دەق یان لە وتەیەكیدا ئیختیلاف دەبوو، بەلام لێرەدا بارێكیتری نوێ پەیدابوو، ئەویش. ئیختیلافاتی سیاسی بوو. كە لە ئاژاوەی شەهیدكرانی خەلیفەی سێیەم عوسمان ﷺ و گوازتنەوەی خەلافەت بۆ كوفە و پاشان بۆ شام دەستی پێكرد و لەوەش روداوی گەورە كەوتنەوە. ئەو روداوانە كاروبارێتری دەرەوەی ئیختیلافیان بۆ نێو بازنەی ئیختیلاف هێنا، كە بوە هۆی گوشەگیربوونی خەلكی هەر ولات و شارێك لەسەر ئەوەی پێیان گەیشتوە لە سوننەتی پێغەمبەرﷺو نورین بە چاوێكی جیاواز و پارێزكارانە لەوەی لای خەلكی شارەكانیتر هەیە كە زورجار بارودوخی تەئیدی سیاسی یان بەرهەلستكاری كاری تێكردوە. ئیراق بە هەردووشارە گەورەكەیەوە (كوفە و بصرە) كرایە كێلگەیەكی بەپیت بۆ كارلێكی فیكرە سیاسییەكان و رێكخستن و ناردنیان بۆ شوێنگەلی جیاجیا. هەر لە ئیراق شیعەگەری[62] پەیدابوو. جوهمیە[63] و موعتەزیلە[64] و خەوارج[65] و كومەلێك لە ئەهلی

---

[62] شیعە: كومەلێكن لە كومەلە ئیسلامیەكان. لەبەر بانگەشەیان بۆ شوێن كەوتنی عەلی و كورەكانی (رضي الله عنهم) وا ناونراون. پێیان وایە كە خەلافەت لە دوای پێغەمبەر ﷺ حەقی ئەوانە. رایان وایە كە ئیمامەت وەك پەیامدارێتی پلەیەكی دینییە. نادرێتە مروڤ و بە هەلبژاردن و شتیتر مروڤ نایگاتی. بەلكو وەك پێغەمبەرێتییە. هەلبژاردن لە خوداوەیە. دەقێكی رون یان شاراوە ئاشكرای دەكا باوریان بە دەركەوتنی موعجزە لەسەر دەستی ئیمام هەیە. وەك چون لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ دەردەكەوت. ئیمامەكان -لای ئەوان- وەك پێغەمبەران لە گوناهی گەورە و بچووك پارێزراون. ئەوانە زور گروپن. دیارترین ئیمامی و زەیدی ن زیاد لەوەی باسمان كرد هەمویان كوكن لەسەر -ولایەتی عەلی و ئیمامەكان لە ئالی بەیت و بێ بەریبون لە موخالیفەكانیان- بە قسە و كردەوە و پەیمان -تەنیا لە حالەتی توقیەدا نەبی- نزیكترین گروپیان لە ئەهلی سوننەت زەیدییەكانن. دوای وان ئیمامیەكان.

بۆ بنەماکانی مەزهەبیان بنۆرە کتێبی (اصول الكافي) و شەرحەکەی و (اصل الشيعة واصولها) بۆ زیاتر شارەزایی لە وتاریان بنۆرە (الملل والنحل)ی شەهرستانی (١/٢٣٤) و الفصل لابن حزم (٤/١٧٩-١٨٨) و الفرق بين الفرق (٢٩) واعتقادات فرق المسلمين (٩٥/٧٧) چاپی مەکتەبی کلیاتی ئەزهەر، والفرق الاسلامية (٣٣) والحور العين (١٧٨) و التبصير في الدين (٤٣/٢٧) چاپی عالم الكتب.

٦٢ الجهمية: کۆمەڵێکن دەدرێنە پاڵ جهم بن صفوان کە لە ساڵی (١٢٨)ك کوژرا. گرنگترین رایەکانی ئەوەیە ، رەوانیە وەسفی خودای گەورە بەسیفەتێك بکرێ، کە بگونجێ کەسێکی‌تر بەشدار بێ تێیدا. بەڵکو وەصف کردنی بەو سیفەتەی کەس بەشداری تێدا ناکا رەوایە لەبەر ئەوەی خالقە. پێیان وایە بەندە ناچار کراوە لەسەر هەر کارێ کە دەیکات.لە بنەرەتدا ئیختیاری هیچ شتێکی نیە.کردەوەکانی بەندە دەدرێنە پاڵ خالق و درانە پاڵ بەندە لەروی مەجازەوەیە. هەروەها باوریان وایە بەهەشت و دوزەخ لەدوای ئەوەی خەڵك چونە ناویان نامێنن، هەروەك هەموو دروستکراوێك نامێنێ. بۆ زیاتر شارەزابوون لە وتارەکانیان بنۆرە: الزينة في الكلمات الاسلامية العربية لابي حاتم احمد بن حمدان الرازي الشيعي (ق٣/٢٦٨) واعتقادات فرق المسلمين (١٠٣) والتبصير في الدين (١٠٧-١٠٨).

٦٤ المعتزلة: کۆمەڵێکن جەماوەری موسوڵمانان ناویان ناون موعتەزیلە. ئەوان ناویان لەخۆناوە ئەهلی عدل و توحيد. رایان وایە هیچ شتێك کۆن نیە جگە لە خودای گەورە. بە گوتەی خەلقکرانی قورئانی مەشهورن. دەڵێن: خودای گەورە بەچەند سیفەتێك وەسف دەکرێ لێی جیا نابێتەوە بە بوونی خۆیەوە راگیرە. لەسەر خودایە سبحانه وتعالى کردەوەی چاك بۆ بەندەی خۆی هەڵبژێرێ. چەند بنەمایەکیان هەیە. بە پێنج بنەماکان ناسراون و مەزهەبەکەیان لەسەر دامەزراندوە، ئەوانەش چەندین تاقمن. بۆ ناسینیان و شارەزابوون لە درێژەی وتارەکانیان. بنۆرە اعتقادات الفرق للرازي (٢٢) و دوای ئەو، التبصير في الدين (٦٣) و دوای ئەو، الملل والنحل (١/٦١-١٣٢) چاپی ئەزهەر. الفرق بين الفرق (٩٣-١٩٠).

٦٥ الخوارج: تاقمێکن لەو تیپانە پەیدابوون کە دژی ئیمام علی ﷺ و معاويە. پاش رووداوی (التحكيم) دەرکەوتن، چەند را و مەزهەب و وتارگەلی درێژیان لەسەر مەسەلەی جۆراوجۆر هەیە. دیارترینیان. ئەو وتەیە کە بەندە تەنیا بە کردنی گوناه کافر دەبێ. هەر بۆیە زۆربەی هاوەڵانیان بەکافر داناوە. لەوانە عوسمان و عەلی و طلحة و زبیر و عائشة رضي الله عنهم أجمعين بۆ ناسینی تیپەکانیان و درێژەی وتارەکانیان. بنۆرە اعتقادات الفرق للرازي (٥١) و التبصير في الدين (٤٥) والملل والنحل (١/١٩٥-٢٥٦) چاپی ئەزهەر والفرق بين الفرق (٥٤-٩٣).

هەواو ئارەزو و بیدعەچی سەریان هەڵدا. هەڵبەستنی فەرموده دەستی پێکرد، چیرۆکی بە ناوەرۆك سیاسی نوسرا، شەرە دەنوکی لەسەر زمانی خەڵك پەرەیسەند، تا ئەوەی ئیمام مالیك دەربارەی کوفە دەڵێ: (کوفە لانەی ئاشوبە)[66] زوهری دەڵێ: (فەرموده لای ئێمە بە بستێك دەردەچوو، لە ئێراقەوە بە باڵێك دەگەڕایەوە).[67]

ئەو کارانە وای لە فەقیهە ئێراقیەکان کرد، پارێز وەربگرن و چەند مەرجێك دابنێن بۆ قبول کردنی ئەو سوننەت و هەواڵانەی پێش ئەوان ئاوریان لێ نەدراوەتەوە. ئەوەش لەبەر رشت بونیان لەسەر ئەوەی کە بیر و رای ئارەزوبازی و بیدعەچی و ململانێکار نەیەتە نێو فیقهەکەیان و دینەکەیان تێك بدات. لە فەقیهە غەیرە ئێراقی‌یەکان هەر مەپرسە کەلە وەرگرتنی شت لە ئێراقی‌یەکان ترس بەچ ئاستی گەیاندبون، تەنانەت خەڵکی حیجاز رایان وابوو فەرموده لە ئێراقی و شامی وەرناگیرێ مەگەر بنەرەتێکی لای حیجازیەکان هەبێ.[68]

بە زانایەکی حیجازی گوترا: فەرموده لە سوفیان الثوری لە منصور المعتمر لە ئیبراهیم النخعی لە علقمه النخعی لە عەبدوڵلای کوری مەسعودەوەیە. واتە: رات چۆنە لە ئیسنادی ئەو زنجیرەیە، کە راستترین ئیسنادە لای ئێراقیەکان؟ گوتی: ئەگەر ئەسڵی لە حیجاز نەبێ وەرناگیرێ.[69]

---

٦٦ الفكر السامي (١/٣١٢).

٦٧ الانتقاء.

٦٨ الفكر السامي (١/٣١٣).

٦٩ الفكر السامي (١/٣١٢).

عەباس. رەبیعەی کوڕی ئەبی عەبدورەحمان[٧٠]ی بەوەزیر و راوێژکار دانا. چونکە مەدینەیی بوو، داوای لێبوردنی کرد. پاش ماوەیەکی کورت گەڕایەوە مەدینە، لێیان پرسی: ئێراق و خەڵکەکەیت چۆن بینی؟ گوتی: میللەتێکم بینی حەڵاڵی ئێمە حەرامی وانە، حەرامیشمان حەڵاڵیانە، زیاتر لە چل هەزار کەسی تێدایە فێڵ لەو دینە دەکەن!!...

لێی دەگێڕنەوە گوتویە: دەڵێی ئەو پێغەمبەرەی بۆ ئێمە نێردراوە غەیری ئەو پێغەمبەرە بێ کە بۆ ئەوان نێردراوە.[٧١]

گەرچی مەبەست لەو وتانە ئەهلی هەوا و بیدعەچی ئێراقن نەك ئەهلی سوننە و جەماوەرەکەی، بەڵام ئەوە بەڵگەیەکی روونە لەسەر هەندێك کاروباری شوێنەوارداری ئەودا دوور لە بزاڤی فیقهی و هەڵوێستی فەقیهەکانی هەردوو شوێن. وە رێگە و مەنهەجیان لە هەڵێنجان دا.

ئەهلی حیجاز باوەڕیان وابوو کە سوننەتیان هەزم کردوە، هیچ شتی ڕیزپەڕیان تێیدا بۆ دەرنەکەوتوە. مەدینە دە هەزار هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ تێدابوو، کە دوای غەزای حنێن لەوێ جێهێشتن و تا کاتی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ تێیدا ژیان. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ؓ کە نامەی بۆ هەر شوێنێك دەنوسی سوننەت و فیقهی فێردەکردن، بەڵام کاتی بۆ مەدینەی دەنووسی پرسیاری رابردوی لێدەکردن و داوای دەکرد فێری ئەو سوننەتانەی بکەن کە لایان هەیە تا بۆ خەڵکانی‌تری بنێرێ.

---

٧٠ ربيعة بن ابي عبدالرحمن التيمي المدني: پێی دەگوترێ فروخ، نازناوی باوکی عوسمانە. لەقەبی (ربيعة الرأي)یە ئیمامێکی موجتەهیدە و لە دیارترین مامۆستاکانی ئیمام مالیك بووە، لە ساڵی (١٣٦) ك یان ساڵی (١٣٣-١٤٢) ك لە هاشمیەی ئەنبار لە ئێراق وەفاتی کردووە سەرگوزەشتەی لە. التهذيب (٢٥٨/٣) وتأريخ بغداد (٤٢٠/٨) والحلية (٢٥٩/٢) و صفه الصفوه (١١٨/٢) والشذرات (١٩٤/١) دا هەیە.

٧١ الفكر السامي (٣١٢/١).

میراتگری سوننەت و فیقهـ و ئەسەری هاوەڵان لە مەدینە سەعیدی کوری موسەییەب و هاورێیەکانی بوون، کە مالیکیی و شافیعیی و حەنبەلیی و ظاهری و کەسانیتر لەوانیان وەرگرت. زانایانی مەدینە -لە تابعیەکان- رایان وایە کە ئەو سوننەت و ئەسەرەی لەبەر دەستیانە بەسە بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی فیقهی و هیچ شتێك ناچاریان ناکا شت بە رەئی -بە هەموو جۆرەکانییەوە- وەربگرن. لەهەمان کات دا هەندێکیان پێچەوانەی ئەوە، بە رەئی شتی وەردەگرت، تا وابووە پێی ناسراوە و وەك نازناو بۆی ماوەتەوە. وەك: رەبیعەی کوری ئەبی عەبدورەحمان ، مامۆستای ئیمام مالیك، کە بە (رەبیعە الرأی) ناودارە، بەلام زۆربەی زۆری زاناکان لەسەر سوننەت و ئەسەر بوونە.

کەچی ئێراقیەکان وەك ئیبراهیم النخعی[72] و هاوەڵانی رایان وابوو کە پشکیان لە سوننەت کەم نیيە، ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان (زیاتر لە سێ سەد کەس) لە نێو ئەوان دا ژیاون. زۆریان فەقیهـ بوون، سەردەستەیان عەبدوڵڵای کوری مەسعود کە لە قورئان دا زانا ترین هاوەڵی پێغەمبەری خودا بووە. هەروەها ئیمام عەلی ﷺ لە ماوەی خەلافەتی و ابوموسای ئەشعەری و عەمار و کەسانیتر لە نێویاندا ژیاون.

ئیبراهیم النخعی و زۆربەی زانایانی ئێراقی رایان وایە کە حوکمە شەرعییەکان مانایان ماقوڵە و هەرچی لە بەرژەوەندی بەندەکان دایە دەیگرێتە خۆی، لە سەر بناغەگەلی پتەو رۆنراون. هۆگەلی رێك و تەواو بۆ ئەو بەرژەوەندی و حوکمانە.

---

٧٢ ابراهيم النخعي: ابراهيم بن زيد النخعي الكوفي، سەرناوی (ابن عمران) ە. سەری قوتابخانەی رەئی و میراتگری فیقهی کوری مەسعود بووە. لە ساڵی (٩٦) ك وەفاتی کردووە. لەوانە بووە کە فیقهـ و فەرمودەی پێکەوە کۆکردەوە. متمانە پێکراو و بەڵگە بوە بەرای گشت. کە هەواڵی مردنی دەگاتە الشعبی دەڵێ: ئیبراهیم کەسی وەك خۆی بە جێنەهێشت. سەرگوزەشتەی لە طبقات ابن سعد (٧١/٦) و صفة الصفوة (٨٦/٣) و التذكرة (٧٣/١) والحلية (٢١٧/٤) وتهذيب التهذيب (٨٧/١)دا هەیە.

تێگەیشتنە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، حوکمەکانی فەرعی لە پێناو ئەو هۆگەلانە دانراون، فەقیهـ ئەو کەسەیە لە دوای هۆگەلی ئەو حوکمانە دەگەڕێ کە لە پێناوی ئەوا دانراون و مەبەستیان لەوانەوە دەزانرێ، تا بون و نەبونی حوکمەکان بە هۆکارەکانیانەوە پەیوەست بێ. هەروەك زانایانی ئێراقی رایان وایە دەقە شەرعییەکان کۆتاییان دێ، بەلاَم روداوەکان بێ کۆتایین. دەقەکان بە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ وەستان، جا ئەگەر هۆکاری ئەو حوکمانەی بە قورئان و سوننەت دامەزراون رەچاونەکرێن، ئەوا ناتوانرێ روبەڕوی پێویستییە شەرعییەکانی خەلَك بکرێنەوە.

حەسەنی کوڕی عەبدوڵلای النخعی دەڵێ: بە ئیبراهیم النخعیم گوت: هەر شتێکی بیستت فەتوای پێ دەدەی چونکە بیستوتە؟ گوتی: نا، گوتم: فەتوا بەوە دەدەی کە نەت بیستوە؟ گوتی: شتێکم بیستوە، شتێکیش هاتوە نەم بیستوە، دەگەڵ ئەوەی بیستومە بەراوردم کردوە[٧٢]. ئەوە شەقڵی قوتابخانەی ئێراق بوە، ئەگەر ئەسەر نەبا ئەوجا کار بەرەئی دەبوو.

بەلاَم سەعیدی کوڕی موسەییەب و زانایانی مەدینە گوێیان بە هۆکاری حوکمەکان نەدەدا، مەگەر کاتێ دەستەوەستانی گەیشتن بە دەقێك یان ئەسەرێك بان. بەلاَم سەعید چۆن دەستەوەستان دەبێ لە کاتێکدا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی ﷺ هەر حوکمێکیان دابێ من پێم زانیوە[٧٤]!! هەروەها ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر ژینگەی ئێراق دا هاتبون بەسەر ژینگەی مەدینە دا نەهاتبون، ئەو روداوانەی لە ئێراق رویان دابو لە مەدینە رویان نەدابوو.

---

٧٢ الفقيه والمتفقه (٢٠٣/١).

٧٤ طبقات ابن سعد٥.

هەر لەبەر ئەوە ئەگەر پرسیاری شتێك لە زۆربەی زانایانی مەدینە بکرابوایە، ئەگەر بەڵگەی لا بوایە وەڵامی دەدایەوە ئەگەر نا عوزری دەخواست.

مەسەلەیەکیان لە مەسروق پرسی، گوتی: نازانم، پێیان گوت: بەرای خۆت قیاسمان بۆ بکە، گوتی: دەترسم قاچم هەڵزەلی.[75]

ئەو شتەی لە خواترسی زانایانی مەدینە، لە قسە کردن بەرەئی و لەو کارەی فەرمودەی لەسەر نی‌یە، رون دەکاتەوە، ئەوەیە کە کوری وهب دەڵێ: مالیك گوتویە: پێغەمبەر ﷺ پێشەوای موسوڵمانان و گەورەی جیهانیان ئەگەر پرسیاری لە شتێك لێ کرابایە، تا سروشی لە ئاسمانەوە بۆ نەهاتبا وەڵامی نەدەدایەوە. جا کە پێغەمبەری پەروەردگاری جیهان بە سروش نەبێ وەڵام نەداتەوە، ئەوا ئەو کەسەی بەرای خۆی یان بە قیاس، یان تەقلیدی کەسێ گومانی چاکی پێدەبا، یان داب و نەریت یان سیاسەت یان زەوق یان کەشف و خەوبینین یان بە چاك زانین یان بە درۆ وەڵام دەداتەوە. دەبێ جورئەتێکی زۆر گەورەی هەبێ. خودا یارمەتیدەر و پشت و پەنامان بێ.[76]

دەگەڵ ئەوەی خیلاف لە نێوان هەردو قوتابخانە توندی کێشا، هەردوو دەستە رەخنەیان لێکتر گرت، کەچی هیچ لایەکیان لە ئەدەبی ئیختیلاف لایان نەدا، وەك لەو گوتوبێژانەی رابردو بۆمان رون بۆوە. سەرەرای ئەو گوتوبێژە زۆرانەی‌تر کە لە نێوان لایەنگرانی هەردو قوتابخانە رویدا هیچ کامیان تێیدا لەسنوری ئەدەبی ئیختیلاف دەرنەچوون[77]، بەکافر دانان و فاسق دانان و تۆمەتی داهێنانی شتی خەراپ و بێ بەری بون لەیەکتر روی نەداوە.

---

٧٥ اعلام الموقعين (٢٥٧/١).

٧٦ اعلام الموقعين (٢٥٦/١) ط. دار الجيل.

٧٧ لەو بارەوە بنورە (اعلام الموقعين ١٣٠/١ و دوای ئەو).

کوری ابی شبرمه دەڵێ: من و ئەبو حەنیفە چوینە لای جەعفەری کوری موحەممەدی کوری حەنیفە، سڵاوم لێ کرد، پێشتر هاوڕێی بوم، روم لە جەعفەر کردو پێم گوت: ئەو پیاوە - خودا بە تووە سودمەندی بکا- خەڵکی ئیراقە، خاوەنی شەرع و عەقڵە. جەعفەر گوتی: رەنگە ئەو کەسە بێ کە دین بەرای خوی قیاس دەکا؟ ئەوجا گوتی: ئا ئەوەیە نعمان؟ ئەبو حەنیفە گوتی: بەڵی، خودا کارسازت بکا، جەعفەر گوتی: لە خودا بترسە، دین بەرای خوت قیاس مەکە، یەکەم قیاسکەر شەیتان بوو، کاتێ خودا فەرمانی پێدا سوژدە بو ئادەم ببا. گوتی: من لەو چاترم، منت لە ئاگر خەلق کرد، ئەویشت لە قور دروستکرد.

پاشان لە ئەبو حەنیفەی پرسی: رستەیەکەم بو بێنە سەرەتای شرك و کۆتایییەکەی ئیمانە؟ ئەبو حەنیفە گوتی: نازانم.

جەعفەر گوتی: ئەوە (لا الە الا اللّٰه)یە، ئەگەر کەسێ بڵێ (لا الە)و دەست هەڵگرێ، کافر دەبێ. ئەو رستەیە سەرەتاکەی شرك و کۆتاییەکەی ئیمانە. پاشان لێی پرسی: کامەیان لای خودا گەورەترە: کوشتنی نەفسێك خودا حەرامی کردوە یان زینا؟ گوتی: بەڵکو کوشتنی نەفسێك.

جەعفەر گوتی: خودا بو کوشتنی نەفسێك بە دوو شایەد رازییە، بەڵام بو زینا لە چوار کەمتر رازی نییە. جا چۆن بە قیاس بۆت دەچێتەسەر؟ پاشان پرسی: کامەیان لای خودا گەورەترە: روژو یان نوێژ؟ ئەبو حەنیفە گوتی: نوێژ. جەعفەر گوتی: ئەی هوی چییە ئەگەر ئافرەت بێنوێژ بوو، روژو دەگرێتەوە بەڵام نوێژ ناکاتەوە؟ ئەی بەندەی خودا لە خودا بترسێ قیاس مەکە. سبەینێ ئێمە و ئێوە لەبەر دادگای خودا رادەوەستین. ئێمە دەڵێین: خودای گەورە فەرمویەتی.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی. تۆ و هاوڕێکانت دەڵێن: قیاسمان کردو رامان وابوو. خودا چۆنی مەیل فەرمووە وامان لێدەکا.[78]

پرسیارەکانی ئیمام جەعفەر وا نەبوون کەسێکی وەك ئەبو حەنیفە لە وەلامدانەوەی رابگرێ. بەلام ئەدەب دەگەڵ بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ وای لێکرد بێدەنگ بێ.

لەو گوتوبێژانەی رابورد وا وەردەگیرێ کە ئەدەبی بەرزی پێغەمبەریتی یارمەتیدەری گوتوبێژکاران بوە. ئیختیلاف بەربەستی لە نێوان برایەکان دروست نەکرد تا رێگەی پێك گەیشتنیان بگرێ. ئەوەی مێژونوسان لە رەقی و رقی ئەو ماوەیە تۆماریان کردوە زوربەی لە نێوان گروپە کەلامی‌یەکان رویداوە، کە خیلافیان لە کارە عەقیدەیەکانیش دا هەبوە. هەندێکیان بۆخۆیان رەوا دابوو تۆمەتی کوفر و فسق و بیدعە بدەنەپاڵ خەڵکانی‌تر. کەچی لە نێوان ئەو گروپانەشدا وانەبوە مێژو شتێك لە ئەدەبی ئیختیلاف نەدۆزێتەوە لەوەی توانراوە تۆماربکرێ.

## گوتوبێژی کوڕی عەباس و خەوارج

عەبدوڵلای کوری موبارەك[79] دەڵێ: عکرمەی کوری عمار، لە سماکی حەنەفی‌یەوە بۆی گێراینەوە، دەڵێ: لە کوری عەباسەوە بیستم گوتی: عەلی دەربارەی خەوارج گوتی: تا دەرنەچن کوشتاریان مەکەن. ئەوان بۆتان دەردەچن. دەڵێ،

---

78 اعلام الموقعين (٢٥٥/١-٢٥٦).

79 عبدا لله بن المبارك بن واضح الحنظلي التميمي المروزي. ناسراو بە ابي عبدالرحمن. فەقیهـ و فەرمودە زان و خاوەن بەڵگە. زانست و پەرستن و جیهاد و بازرگانی پێکەوە گرێدابوو. بە خۆپارێزو لە خواترس بەناوبانگە. لەشاری هیت (ئێراق) لە ساڵی (١٨١) ك وەفاتی کردوە. سەرگوزشتەی لە: طبقات ابن سعد (٣٧٢/٧) و الشيرازي (٧٧) والجرح والتعديل (٢ق١٧٩/٢) والتذكرة (٢٧٤/١) والحلية (١٦٢/٨) وتهذيب التهذيب (٣٨٢/٥)دا هەیە.

گوتم: ئەی میری باوڕداران -بۆ دڵارامی نوێژێك دەكەم- و دەمەوێ بچمە لایان گوێ لە قسەیان بگرم و بیاندوێنم. گوتی: دەترسم مەترسیان بۆت هەبێ. كوڕی عەباس دەڵێ: من پیاوێكی روخۆش بوم كەسم ئازار نەدەدا، چاكترین پۆشاكی یەمەنیم پۆشی و پیادەڕۆ گەیشتمە لایان، گوتیان: ئەو پۆشاكە چییە؟ ئەو ئایەتەم بۆ خوێندنەوە: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ الاعراف: ٣٢

گوتم: پێغەمبەری خودام ﷺ بینیوە چاكترین پۆشاكی یەمەنی پۆشیوە. گوتیان: قەیناكا، بۆچی هاتوی؟ گوتم: لای هاوڕێكەمەوە بۆ لاتان هاتوم، كە كوڕی مام و هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ. هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی وەحی لە ئێوە زاناترن، قورئان دەربارەیان دابەزیوە، هەواڵی وانتان پێ دەدەم و داخوازی ئێوەش بەوان دەگەیەنم. رەخنەی ئێوە چییە؟ هەندێكیان بە نەهی كردنەوە گوتیان: نەكەن بیدوێنن، قورەیشی هۆزێكی بەشەڕەقسەن، خودا دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾ الزخرف: ٥٨.

هەندێك گوتیان بیدوێنن. دوو سێ پیاویان رێی دوانیان دام و گوتیان: چ دەتەوێ خۆت بدوێ، چ دەتەوێ ئێمە دەدوێین. گوتم: ئێوە بدوێن. گوتیان: لە سێ شت رەخنەمان لە عەلی هەیە: حوكمی دا دەست پیاوان، خوداش دەفەرموێ: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ الانعام: ٥٧ یوسف: ٤٠، ٦٧ گوتم: خودای گەورەش لە چارەگە درهەمێكی كەروێشك[80] و ناكۆكی ژن و مێرد حوكمی كاری خۆی داوەتە دەست پیاوان: ﴿فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا﴾ النساء: ٣٥.

---

٨٠ ئامارژەیە بۆ ئایەتی: ﴿فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ المائدة: ٩٧ سەبارەت بە كوشتنی نێچیر لە ئیحرامدا.

جا حوكم كردن له نێوان ژن و مێرد و بەندەیەك چاكترە یان حوكم كردن لە نێوان ئوممەتێك پێی بگەڕێتەوە و خوێن ڕێژیان ڕاگرێ و ئەوەی لە دەستی دەرچووە بیگێڕێتەوە؟ گوتیان: ڕاستە.

گوتیان: ئەوەیتر، بە نارەوا لە هەقی خۆی دابەزی بەوەی كە میری باوەرداران بێ، ئەگەر میری باوەرداران نەبێ، ئایا میری بێ باوەڕانە؟ پێیم گوتن: ئایا ئەگەر لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەم بۆ هێنان، دەگەڕێنەوە، گوتیان بەڵێ. گوتم: بیستوتانە یان پێتان گەیشتووە، لە پەیمانی حودەیبیە سهیلی كوڕی عەمرو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ.پێغەمبەر ﷺ بە عەلی فەرموو (بنووسە... ئەوە شتێكە موحەممەد رسول الله ﷺ لەسەری ڕێك كەوتوە). سهیل گوتی: ئەگەر بزانین تۆ پێغەمبەری خودای جەنگمان دەگەڵ نەدەكردی. پێغەمبەر ﷺ فەرموی (ئەی عەلی بیسڕەوە) گوتم: ئایا بەوە قایل بوون، گوتیان بەڵێ.

گوتم: بەڵام لەوەی دەیڵێن: عەلی كوشتاری كردوە، بەڵام دیلی نەكردوتە بەندەو تالانی نەكردوە (لەشەڕی الجمل و صفین)، ئێوە دایكتان بە بەندە دەگرن؟ ئەوەی بە حەلالی دەزانن لە خەڵكیتر لەویش بەحەلالی دەزانن؟ ئەگەر دەڵێن: بەڵێ. ئەوە كفرتان بە كتێبی خودا كرد و لە ئیسلام دەرچوون. جا ئێوە لە نێوان دوو گومراییدان.

هەركە شتێكم لەو بابەتە بۆ دەهێنانەوە، دەمگوت: ئایا بەوە قایل بوون، دەیانگوت: بەڵێ. دوو هەزاریان لێ گەڕانەوە و شەش هەزاریان مانەوە.[81]

ئەوانە تاقمێك بوون شمشێریان بۆ جەنگ هەڵكێشابوو، خوێنی موخالیفەكانیان بە حەلاڵ دەزانی، بەڵام دەگەڵ ئەوەش دا كاتی بە هەق دوێنران زۆریان بە دەمیەوە هاتن. كاتێ قورئانیان خرایەوە بیر، بیریان كردەوە و كاتێ بۆ

81 اعلام الموقعين (١/٢١٤-٢١٥) لە ڕێگەیتریش بە وتەی جۆرلوجۆر لێیەوە هاتووە.

گوتوبیژ بانگ کران به دڵێکی کراوه وه‌ڵامیان داوه. موسوڵمانانی ئه‌مرۆ و ئه‌و جوره ئادابه له کوین؟!

## مەزەبە فیقهی‌یەکان

مەزەبە فیقهی‌یەکان کە دوای چەرخی هاوەڵان و گەورە تابعی‌یەکان پەیدابوون، هەندێك بە سێزدە مەزەبی دەژمێرن. خاوەنی هەمویان سەر بەمەزەبی ئەهلی سوننەن، کە مەزەبی زۆربەی جەماوەری موسوڵمانان بوە و هەرواش ماوە. بەڵام تەنیا فیقهی هەشت یان نۆ ئیمام بەختی نوسینەوەیان هەبووە. ئەوەندەی نوسراونەتەوەش وەك یەك نین، هەندێکیان هەموو فیقهەکەیان بە تەواوی نوسراوەتەوە، لە کاتێکدا ئەوانی‌تر چەند لایەنێکی کەمیان نوسراوەتەوە. ئی هەموو ئەوانەی نوسراونەتەوە و بنەمای مەزەب و مەنهەجە فیقهیەکانیان ناسراوە. بریتین لە:

یەکەم: ئیمام ابو سعید الحسن بن یسار البصری ساڵی (١١٠ ك) وەفاتی کردوە.

دووەم: ئیمام ابو حنیفه النعمان بن ثابت بن زوطی ساڵی (١٥٠ك) وەفاتی کردوە.

سێیەم: ئیمام الاوزاعی ابو عمرو عبدالرحمن بن عمر و بن محمد ساڵی (١٥٧ك) وەفاتی کردوە.

چوارەم: ئیمام سفیان بن سعید بن مسروق الثوري ساڵی (١٦٠ ك) وەفاتی کردوە.

پێنجەم: ئیمام اللیث بن سعد ساڵی (١٧٥ك) وەفاتی کردوە.

شەشەم: ئیمام مالك بن انس الاصبحی ساڵی (١٧٩ ك) وەفاتی کردوە.

حەوتەم: ئیمام سفیان بن عیینیه ساڵی (١٩٨ ك) وەفاتی کردوە.

هەشتەم: ئیمام محمد بن ادریس الشافعی ساڵی (٢٠٤ ك) وەفاتی کردوە.

نۆیەم: ئیمام احمد بن محمد بن حنبل ساڵی (٢٤١ ك) وەفاتی کردوە.

یەکیکیتر ئیمام داودی کوری عەلی ئەسبەهانی بەغدادی ناسراو بە (الظاهري)، چونکە بە رواڵەت (ظاهر)ی وتەکانی قورئان و سوننەت حوکمی کردوە، ساڵی (٢٧٠ک) وەفاتی کردوە.

جگە لەوانەش زورن وەك: ئیسحاقی کوری راهەوەی ساڵی (٢٣٨ ك) وەفاتی کردوە. ئەبی سەور ئیبراهیم کوری خالید کەلبی ساڵی (٢٤٠ ك) وەفاتی کردوە. هەروەها ئیتریش هەن مەزەبیان بلاو نەبوتەوە و شوین کەوتەیان زورنەبون یان پییان وابوە لاسا کەرەوەی خاوەن مەزەبە ناسراوەکانن.

بەلام ئەوانەی مەزەبیان ریشەی داکوتاوە و تا ئەمروش ماونەتەوە، ئیستاش لە هەموو ولاتانی ئیسلامی شوین کەوتەی زوریان هەیە. بەردەوامیش فیقهو و بنەمای فیقهیان لای جەماوەری زانایان بواری تیروانین و فەتوادانن. ئەوانەیش ئەو چوار ئیمامەن: ئەبو حەنیفە، مالیك، شافیعی، ئەحمەد.

## مەنهەجی ئیمامە ناسراوەکان

ئیمام مالیك و شافیعی و ئەحمەد هەرسیکیان بە فەقیهی فەرمودە و ئەسەر دادەنرین، ئەوان فیقهی خەلکی مەدینەیان وەرگرت و بونە هەلگری زانستیان. بەلام ئیمام ئەبو حەنیفە میراتگری فیقهی ئەهلی رەئی بوو، لەسەردەمی خوی دا پیشەنگی قوتابخانەکەیان بووە.

ئەو ئیختیلافەی لە نیوان قوتابخانەی (سەعیدی کوری موسەییەب) کە لە سەر فیقهی هاوەلان و کارەکانیان بنیادنرابوو. مالیکیی و شافیعیی و حەنبەلیی لەسەر مەنهەجی ئەو رویشتن، دەگەل قوتابخانەی (ئیبراهیم النخعی) ئەگەر ئەسەر نەبوایە پشتی بە رەئی دەبەست. ئەو ئیختیلافە، زور ئاسایی بوو بو هەموو ئەوانە بگوازریتەوە کەلەسەر مەنهەجی یەك لەو دوو قوتابخانەیە بوون. کەس نکولی ناکا کە لەو سەردەمەدا خیلاف زور لە توندیەکەی لە دەست دا، ئەوەش دوای گوازتنەوەی

خەلافەت بۆ بەرەی عەباس، عەباسی‌یەکان هەندێك گەورە زانای حیجازیان بۆ ئیراق گوازتەوە تا لەوێ سوننەت بلاْوبکەنەوە، لەوانە: رەبیعەی کوڕی ئەبی عەبدورەحمان ، یەحیای کوڕی سەعید[82]، هیشامی کوڕی عوروە[83]، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق[84] و کەسانی‌تر. هەروەها هەندێك لە ئیراقی‌یەکان بۆ مەدینە کۆچیان کردو لە لای زانایانی مەدینە خوێندیان، وەك: ئەبی یوسف یەعقوبی کوڕی ئیبراهیم[85]،

---

٨٢ يحيى بن سعيد بن فروخ القطان التميمي البصري. سەرناوی (باوکی سەعید)ە، یەك لە گەورە لەبەرکەرانی فەرموودە بوو، ئیمامێکی (حجة ثقة ثبت) بووە. لە هاوشانی ئیمام مالیك و لە ناسینی پیاوان دا زاناترین کەس بووە. لەسەردەمی خۆیدا لە راستی و ناراستی فەرموودە شارەزاترین کەس بووە. زۆر جار بەرای ئەبو حەنیفە فەتوای داوە. لە سالّی (١٩٨)ك وەفاتی کردووە. سەرگوزەشتەی لە: طبقات ابن سعد (٢٩٣/٧) والحلية (٣٨٢/٨) والجرح والتعديل (٤/ق٢/١٥٠) وتأريخ بغداد (١٣٥/١٤) والتذكرة (٢٩٨/١) وتهذيب التهذيب (٢١٦/١١) دا هەیە.

٨٣ هشام بن عروة بن زبير بن العوام، ابو المنذر اسدي، لە تابعی‌یەکانە. جێ متمانە و باوڕ (ثقة حافظ متقن ثبت) بوو. فەقیه و فەرموودە ناس و گەورە زانای سەردەمی خۆی بووە لە مەدینە، لە سالّی (١٤٥)ك یان (١٤٦-١٤٧) وەفاتی کردووە. سەرگوزەشتەی لە: طبقات ابن سعد (٣٢١/٧) والجرح والتعديل (٤ق٢/٦٣) وتأريخ بغداد (٣٧/١٤) وتهذيب التهذيب (٤٨/١١) دا هەیە.

٨٤ محمد بن اسحاق بن يسار، مەدینەیی‌یە، هاتوتە ئیراق لە سالّی (١٥١)ك لە بەغدا وەفاتی کردوە. ئیمامی ئەهلی گەشت و غەزا بووە. سەرگوزەشتەی لە: طبقات ابن سعد (٣٢١/٧) و تاريخ بغداد (٢١٤/١) و التذكرة (١٧٢/١) و الجرح والتعديل (٣ق٢/١٩١) والميزان (٤٦٨/٣) وتهذيب التهذيب (٣٩/٩) دا هەیە.

٨٥ يعقوب بن ابراهيم بن حبيب الانصاري الكوفي البغدادي، لە گەورە قوتابی و هاوڕێ نزیکەکانی ئەبو حەنیفە بووە. سەرۆکی (قاضی)یەکانی هادی و مهدی و رشید بووە. لەسالّی (١٨١-١٨٢) لە بەغدا وەفاتی کردووە. سەرگوزەشتەی لە: تاريخ بغداد (٢٤٢/١٤) و التذكرة (٢٩٢/١) و الجرح والتعديل (٤ق٢/٢٠١) وطبقات ابن سعد (٣٣٠/٧) و الجواهر المضيئة (٢٢٠/٢) دا هەیە. هەروەها لێکۆڵینەوەی تایبەت سەبارەت بە سەرگوزەشتە و پلە و پایەی کراوە.

موحەممەدی کوڕی حەسەن[٨٦]، هەردووکیان لای مالیك[٨٧] خوێندویانە، هەروەها زۆر لە ڕاو بۆچۆنی ئێراقی‌یەکان بۆ حیجاز گوازرایەوە، هەروەك گوازرانەوەی بۆچونی حیجازیەکان بۆ ئێراق. دەگەڵ ئەوەش دا دەبینین هەرسێ ئیمام (مالیك، شافیعی، ئەحمەد) مەنهەجێکی لێك نزیکیان پێك هێناوە، گەرچی لە هەندێك پەیرەو و ڕێگەکانی هەڵێنجان دا ئیختیلافیان هەیە، لە کاتێکدا ئیمام ئەبو حەنیفە لە مەنهەج دا لەوان جیا دەکرێتەوە .

### ١- مەنهەجی ئیمام ئەبو حەنیفە:

ئیمام ئەبو حەنیفە وەك هێمایەك بۆ مەنهەجێکی جیاواز لە مەنهەجی هەرسێ ئیمامەکان بە شێوەکی دیار مایەوە، ڕێسای مەزەبەکەی وەك بە وتەیەکی خۆی پوختەکەی ڕون کردۆتەوە و دەڵێ: (من حوکم بە کتێبی خودا دەکەم، ئەگەر تێیدا دۆزیمەوە، ئەگەر نەمدۆزیەوە، ئەوا حوکم بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەسەرە تەواوەکانی دەکەم، کە لەسەر دەستی کەسانی متمانە پێکراو بڵاو بونەتەوە، ئەگەر لە کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەمدۆزیەوە، بە گوتەی هاوەڵانی، گوتەی هەرکامێکی ویستم حوکم دەکەم، لە گوتەی ئەوانیش لانادەم بۆ وتەی غەیری ئەوان. ئەگەر کار گەیشتە ئیبراهیم و شعبی و کوڕی موسەییەب (چەند پیاوێکی ژمارد) بۆم هەیە ئیجتهاد بکەم، وەك ئەوان ئیجتهادیان کرد).

ئەمە بوو بنەما سەرەکیەکانی مەزەبی ئەبو حەنیفە، بنەمای فرعی یان لاوەکیشی هەیە لەو بنەمایانە جیابونەتەوە یان دەچنەوە سەریان. کە لەوان دا

---

٨٦ محمد بن الحسن: هاوڕێی ئەبو حەنیفە و بڵاوکاری فیقهەکەی بووە. سەرناوی ابی عەبدوڵڵایە. قازی‌یەتی رقعە و رەی بۆ رەشید کردووە. لەساڵی (١٨٩) ك لە رەی وەفاتی کردووە. سەرگوزەشتەی لە: طبقات ابن سعد (٣٣٦/٧) والميزان (٥١٣/٣) وتاريخ بغداد (١٧٢/٢) و الشذرات (٣٢١/١) والجواهر المضيئة (٤٢/٢) دا هەیە.

٨٧ الفكر السامي ٤٣٤/١-٤٣٥.

خیلاف هەیە و دەوردەکەوێ، وەك دەڵێن: (قطعیة دلالة اللفظ العام کالخاص)[88] و (مذهب الصحابی علی خلاف العموم مخصص له)[89] و(کثرة الرواة لاتفید الرجحان) و(عدم اعتبار مفهوم الشرط و الصفة)[90] و (عدم قبول خبر الواحد فیما تعم به

---

٨٨ العام: گشتی: وشەیەکە هەموو ئەو وشانە دەگرێتەوە کە هاو واتان، وەك: (هەموو) (سەرجەم) و هی‌تر.

الخاص: تایبەت: وشەیەکە ئاماژە بۆ دیاری کراو دەکا، وەك ناوێکی ناسراو و لەو بابەتە.

القطعي: ئەومیان قەتعی بوون دەگەیەنێ، هەندێك جار دەقەکان دەلالەت و ثبوتیان قەتعی‌یە، وەك ئایەتە مەبەست دیارەکانی قورئان و دەقە مەحکەمەکانی. هەندێك جار دەقەکان ثبوتیان قەتعی‌یە و دەلالەتیان زەنی‌یە. ئەوەش کاتێ بە رێگەیەکی ئیحتمال هەڵنەگر ثابت دەبێ و قەتعی دەگەیەنێ وەك ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەی متواتر ئەگەر مانا ئیحتمالی زیاتر لە رویەکی هەبوو ئەوا بە پێی مانای ئیحتیمال کراو دەلالەتی زەنی دەبی، وەك ئایەتی ﴿يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾ ئەوە دەقێکی قەتعی‌یە چونکە قورئان بە تواتر بە ئێمە گەیشتووە، بەڵام دەلالەتی زەنی‌یە، پاکی یان بێ نوێژی. زانایان ئیختیلافیان لە مەبەست بە (قروء) هەیە، ئایا مەبەست بێ نوێژی‌یە، یان پاکی‌یە، هەر دەستەی شتێکی گوتوە.

٨٩ بەڵگە گشتی‌یەکان تایبەتی‌یان بەسەردادێ، وەك ئیستثناء و وێنەی ئەوە، ئەوەی هەندێك لە زانایان گشتێتی بەڵگەی پێ تایبەت دەکەن: کردەوە و مەزهەبی صحابی‌یە، بە پێچەوانەی باو وای بۆ دەچن ئەو بەڵگەیە تایبەتە، چونکە وای دادەنێن کە صحابی پێچەوانەی گشتێتی بەڵگەی زانراو کارناکا مەگەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ زانیبێتی کە ئەو بەڵگەیە گشتێتی تایبەت دەکا.

٩٠ دەلالەتی مفهوم، دەلالەتی وتەیە لەسەر حوکمی شتێکی باسنەکرا و لە گوتاردا، وەك دەلالەتی فەرمودەی خودای گەورە: ﴿قُل لَّا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا﴾ لە وشەی (مسفوح) هوە وا وەردەگیرێ کە خوێنی (لەبەر ئاژەڵ نەرژیشتوو) وەك جگەر و سپڵ حەڵاڵە. مفهومی شەرت دەلالەتی وتەیە بۆ حوکمێ لەسەر شەرت بوەستێ تا دژی ئەو حوکمە دێتە دی، ئەویش نەبونی شەرتە. خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ...﴾ لەو دەربڕینەدا دەلالەت لەسەر واجب بونی نەفەقە دەکا بۆ عیددەداری سك پڕ تا سکەکەی دادەنێ. بە مفهومی شەرتیش دەلالەت لەوەدەکا کە نەفەقە بۆ عیددەدارێك نی‌یە سك پڕ نەبێ.

البلوى)[91] و (مقتضى الامر الوجوب قطعا مـا لم يـرد صـارف) و (اذا خـالف الـراوى الفقيه روايته بان عمل على خلافها: فالعمل بما رأى لا بما روى)و (تقديم القياس الجلي على خبر الواحد المعارض له)و (الاخذ بالاستحسان[92] و ترك القياس عندما تظهـر الى ذلك حاجة) ئەوەش لە ئیمام ئەبو حەنیفە دەگێڕنەوە کە فەرمویە: (ئەو زانستەی ئێمە رەئیيە ئەوە چاکترین شتە پێی گەیشتوین، هەرکەس لەوە چاکترمان بۆ بێنێ وەری دەگرین).

**٢- مەنهەجی ئیمام مالیك:**

**ئیمام مالیك رەحمەتی خودای لێبێ مەنهەجێکی جیاوازی هەیە، دەفەرموێ: (هەر کە پیاوێك دەهاتە لامان لە ترسی دەمەقالێ وازمان دێنا لەوەی جبریل بۆ موحەممەدی ﷺ هێناوە)[93] وەك باسمان کرد مەزهەبی ئەو مەزهەبی حیجازییەکانە لە هاوەڵانی قوتابخانەی ئیمام سەعیدی کوڕی موسەییەب رەحمەتی خودای لێبێ، پوختەی رێسای مەزهەبی مالیك بەم شێوەیە:**

**•حوکم کردن بە دەقی قورئانی پیرۆز.**

---

ومفهوم الصفة: هو دلالة اللفظ الموصوف بصفة على ثبوت نقيض حكم المنطوق به عند عدم تلك الصفة، مثل قوله تعالى (وحلائل ابنائكم الذين من اصلابكم...) فان الاية دالة بلفظها على تحريم زوجة الابن على ابيه اذا كان من صلبه، ودلت بمفهوم الصفة على عدم تحريم زوجة الابن المتبني على من تبناه، لانه ليس من الاصلاب.

٩١ عموم البلوى: **سەختڵەتی گشتی: مەبەست بوتەی زلنایان لەسەر گشتێتی سەختڵەت ئەو کارانەیە کە زەحمەتە بە ئاسانی خۆی لێ لابدرێ، وەك: قوڕی شەقام و ئەو ئاوەی لە لوساوك (سولاوك) دێتە خوار. یان کەوتنە خواری جیقنەی باڵندە و چۆلەکە. یان میزێ لەبەرزییەوە بەسەر پۆشاکدا دەپرژێ، یان هاتوچۆی پشیلەی ماڵان و شتیتر.**

٩٢ الاستحسان: **بە چاك زانین: لادان لە حوکمی مەسەلەیەك کە وێنەی هاوشێوەی ئەو مەسەلەیە حوکمی لەسەر هەیە، لادان بۆ خیلافی ئەو لەبەر شتێك ئاسانی دەخوازێ. بنوڕە:** رفع الحرج الدكتور يعقوب الباحسين (٣٩٦).

٩٣ الفكر السامي (١/٣٧٨).

- دوای ئەو بە ڕواڵەتی ئایەتەکانی، ئەوەش گشتی‌یە.
- پاشان بە بەڵگەکەی (ئەوەش مەفهومی موخالەفەیە).
- پاشان بە مەفهومەکەی (ئەوەش مەفهومی موافەقەیە).
- بە وریاکردنەوەکانی (قورئان) (ئەوەش وریا کردنەوەیە لە هۆیەکەی، وەك ئایەتی ﴿فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا﴾.

ئەوە پێنج بنەمای قورئانن و لە سوننەتیش بە هەمان شێوە پێنجن کە دەکاتە ده. دوای ئەوانە:

- کۆڕای زانایان.
- قیاس.
- کردەوەی خەڵکی مەدینە.
- بە چاك زانین (استحسان).
- حوکم بە (سد الذرائع).
- المصالح المرسلە.[94]
- گوتەی صحابی (ئەگەر سەنەدی تەواو بێ و لەناودارەکان بێ).
- ڕەچاوکردنی خیلاف (ئەگەر بەڵگەی موخالیف بەهێز بوو).

---

٩٤ المصالح المرسلە: هەموو سودێك کە گونجاو بێ دەگەڵ کردە و مەبەستەکانی یاسادانەر و هیچ ئەسڵێکی دیاریکراو داینەنابێ و وەلاشی نەنابێ. وەك بەڵێنی پیشەگەرێتی (عقد الاستصناع) وەك ئەوەی پەیمان دەگەڵ کەسێك دەبەستی شتێکت بۆ دروست بکا کە لە کاتی بەڵێندانا نی‌یە. وا باوە حوکمەکانی یاسادانەر ئەو بەڵێنە بەراست دانانێ مەگەر لەسەر شتێکی زانراو نەبێ کە بتوانرێ یەکسەر تەسلیم بکرێ. پیشەگەرێتی لەوشتانەیە کە پێش بەڵێنەکە نین. بەڵام بەرژەوەندی خەڵکی تێدا دیارە و قەدەغەکردنی دەبێتە لەدەستچوونی ئەو بەرژەوەندی‌یە، جا بۆیە یاسادانەر ڕێی‌داوە. هەروەها سەبارەت بە بەڵێنی ڕەزامەندی و بەخشینکاریش لەبەر پێویستی خەڵك پێیان و دەستخەری بەرژەوەندی‌یان هەندێك لەزانایان تێیاندا لە سنووری مەرجەکانی (ایجاب و قبول) دەرچوونە.

- هاوڕێیەتی (الاستصحاب).
- شەرعی پێش خۆمان.

### ٣- مەنهەجی ئیمام شافیعی:

ڕێسا و بنەماکانی مەزهەبی ئیمام شافیعی ڕەحمەتی خودای لێبێ ئەوەیە کە لە نامە ئوصولێیەکەی (الرسالە) کۆی کردۆتەوە. کە بە یەکەم کتێبی ئوصولی تەسەل دادەنرێت لە ئیسلامدا نوسرابێ. فەرموویەتی: (قورئان و سوننەت ئەسڵن، ئەگەر تێیاندا نەبوو قیاسیان لە سەردەکرێ، ئەگەر فەرمودە گەیشتەوە پێغەمبەری ﷺ سەنەدەکەشی تەواو بوو، ئەوە کۆتایی پێ دێ، ئیجماعیش لەپێشترە لە هەواڵی تاك، فەرمودەش بە ڕواڵەتەکەیەتی، ئەگەر چەند مانایەکی هەڵگرت ئەوەی لە ڕواڵەتەکەی نزیکتربێ ئەو لە پێشترە. ئەگەر فەرمودەکان هاوتای یەك بوون کامە سەنەدی ڕاستتر بێ لەپێشترە، ئەگەر سەنەد پچڕانی تێدا بوو وەرناگیرێ بێجگە لە سەنەدی (کوڕی موسەییەب)، ئەسڵ لە سەر ئەسڵ قیاس ناکرێ، بۆ ئەسڵ ناگوترێ بۆچی و چۆن؟ بەلاَم بۆ فرع دەگوترێ بۆچی؟ ئەگەر قیاسی فرع لەسەر ئەسڵ ڕاست بوو، ڕاستە و دەبێتە بەڵگە).[٩٥]

کەواتە: ئیمام شافیعی رای وایە قورئان و سوننەت لە شەریعەت دا یەکسانن، هیچ مەرجێك بۆ فەرمودە دانانێ تەنیا ڕاستی و گەیشتنەوەی بە پێغەمبەر ﷺ نەبێ، چونکە ئەسڵە، ئەسڵیش پێی ناگوترێ: بۆچی و چۆن؟ مەشهور بوونی فەرمودە[٩٦] بەمەرج دانانێ ئەگەر بۆشتێ هاتبێ سەخڵەتی گشتی بێ. وەك ئیمام ئەبو حەنیفە

---

٩٥ المنهاج للنووی والفکر السامي (٣٩٨/١).

٩٦ الحدیث المشهور: بە ڕێگەی زیاتر لە دوکەسەوە هاتووە، یان لە هەر چینێك سێکەس یان زیاتر ریوایەتیان کردووە و نەگەیشتۆتە ئاستی تواتر، لەبەر مەشهوری و ئاشکرلو ڕوونی واناونرلوە، بنوڕە: شرح نزهة النظر في توضیح نخبة الفکر (١٧) چاپی دانشگای سەلەفی (نارس) هندستان.

به مەرجی داناوە، مەرجی موخالەفەنەكردنی فەرمودەی بۆ كردەوەی خەڵكی مەدینە دانەناوە -وەك ئیمام مالیك دایناوە- بەڵام بە (فەرمودە مورسەلەكان)ی وەرنەگرتوە. تەنیا (مراسیل)[97]ی سەعیدی كوڕی موسەییەب نەبێ. چونكە لای ئەو ڕێگەی گەیشتنەوەی بە پێغەمبەر ﷺ هەبوە. لەوەشدا خیلافی مالیك و ثوری و هاودەمانی خۆی بوو-لە فەرمودە ناسان- چونكە ئەوان (مراسیل)یان بە بەڵگە دادەنا[98]. نكوڵی بەڵگە سازی بە (الاستحسان) دەكا. لەوەش موخالیفی حەنەفی و مالیكیشە. لە ڕەدی (استحسان) كتێبی (ابطال الاستحسان)ی نوسیوە. لە گوتە بەناوبانگەكەی دا دەڵێ: (ئەوەی بە استحسان بكا ئەوە شەرعی داهێناوە). هەروەها ڕەدی (المصالح المرسلة)ی داوەتەوە و نكوڵی بە بەڵگە دانرانی كردوە. نكوڵی بە بەڵگە دانرانی ئەو قیاسەشی كردوە كە هۆیەكی ڕون و ئاشكرای نەبێ. نكوڵی بە بەڵگە دانرانی كردەوەی خەڵكی مەدینەشی كردوە، هەروەك نكوڵی حەنەفیەتیشی كردوە لەسەر وازهێنان لە كاركردن بە زۆر سوننەت لەبەر نەبونی ئەو مەرجانەی كە لەسەریان دانابوون وەك مەشهور و شتیتر، هەروەها -وەك مالیك نەبووە- هەر تەنیا فەرمودەی حیجازیەكان وەربگرێ.

ئەوەبوو بە كورتی گرنگترین و دیارترین بنەماكانی مەزهەبی ئیمام شافیعی، موخالەفەی هەندێك لە بنەماكانی مەزهەبی حەنەفی و مالیكی تێدایە كە ناشاردرێنەوە.

---

97 الحديث المرسل: ئەو فەرمودەیە دوایین سەنەدی لەپاش تابعی نامێنێ، وەك ئەوەی تابعی بڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویە: ... بێ ئەوەی ناوی ئەو كەسە بێنێ كە لە پێغەمبەر ﷺ ڕیوایەتی كردوە.

98 الفكر السامي (١/٣٩٩).

## ٤- مەنهەجی ئیمام ئەحمەد کوڕی حەنبەل:

ڕێساکانی مەزهەبی ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خودای لێبێ زۆر نزیکە لە ڕێساکانی مەزهەبی ئیمام شافیعی (کە لەمەو پێش باسمان کرد)، ئیمام ئەحمەد حوکم دەکا بە:

یەکەم: دەقەکانی قورئان و سوننەت، ئەگەر تێیدا دۆزییەوە ئاوڕ بۆ هیچیتر ناداتەوە، هیچ شتێك وەپێش فەرموودەی سەحیحی مەرفوع (بۆ پێغەمبەر ﷺ) ناخات وەك (کردەوەی خەڵکی مەدینە یان ڕەئی یان قیاس یان گوتەی صحابی یان کۆڕایەك کە نەزانرابێ موخالیفی هەیە).

دووەم: ئەگەر بۆ مەسەلەیەك دەقێکی نەدۆزیبایەوە، بۆ فەتوای هاوەڵان دەگەڕایەوە، ئەگەر ڕای یەکێکیانی پێ گەیشتبا، زانیبای هاوەڵێکیتر پێچەوانەی نیە، بۆ غەیری ئەو نەدەگەڕایەوە و هیچ کردەوە و ڕەئی و قیاسیشی پێش ئەو نەدەخست.

سێیەم: ئەگەر هاوەڵان ئیختیلافیان هەبێ کامە ڕایان لە قورئان و سوننەت نزیکتر بێ ئەویان هەڵدەبژێرێ و لە قسەیان دەرناچێ، ئەگەر بۆی ڕوون نەبێتەوە کامەیان لە قورئان و سوننەت نزیکترە، خیلافەکەیان باس دەکا و بە هیچ یەك لە ڕایەکان نایبڕێتەوە.

چوارەم: بە فەرموودەی مرسل و لاواز لە ناچاری حوکم دەکا ئەگەر لەو دەروە (باب)ەدا لەو زیاتر نەبێ، لە کاتێکدا لاوازییەکەی پاڵپشتێکی هەبێ. هیچ ئەسەرێ یان گوتەی صحابی یان کۆڕایەکی پێچەوانەی، لای ناداو وەپێش قیاسیشی دەخا.

پێنجەم: قیاس لای ئەو بەڵگەیەکە بۆ پێویستی کاتێ هیچ یەك لەو بەڵگانەی پێشتر نادۆزێتەوە پەنای بۆ دەبا.

شەشەم: بە (سد الذرائع)[99] حوكم دەكا.

## ٥- مەنهەجی ئیمام الظاهري:

رەنگە گونجاو بێ بەكورتی بناغەی مەزهەبی ظاهری و بنەماكەی بخەینەروو، چونكە ئەو مەزهەبە لە مەزهەبە شوێن پێ دیارەكانی ئیسلامییە، كە تائێستاش لە نێو ئەهلی سوننە شوێنكەوتەی هەیە، سەختترین جۆرەكانی خیلاف لە نێوان ظاهری و حەنەفی و دوای ئەو مالیكی و دوای ئەو حەنبەلی و پاشانیش شافیعی، روویداوە، ئیمام داود (ئیمامی ظاهری) دان بەزۆر لە چاكەی ئیمامی شافیعی دا دەنێ.

دیارترین بنەمای مەزهەبی ظاهری: (دەستگرتنە بە رواڵەتی ئایەتەكانی قورئان و سوننەت و وەپێش خستنیانە لە سەر رەچاوكردنی مانا و حوكم و بەرژەوەندییەك كەوا گومان دەبرێ لە پێناوی دا ئەو شەرعە دانرابێ. لای ئەوان كار بە قیاس[100] ناكرێ ئەگەر هۆی (قیاس لەسەر كراو) دەقی لەسەر نەبێ و قەتع نەبێ بەبونی قیاس كراو بەشێوەیەك حوكمەكە بگاتە ئاستی وەدەست خستنی مەبەست (تحقیق المناط).[101]

---

٩٩ سد الذرائع: الذريعة: لە زمانەوانیدا: ئامرازێكە پێی دەگەینە شتێكیتر جا ئەو شتە (ماددی یان مەعنەوی، خێر یان شەر) بێ. لە زاراوەدا: گەیەنەرە بۆ شتێكی قەدەغەی پێكهاتوو لە مەفسەدە، وەك: تۆڕین بۆ ئافرەتی بێگانە، هۆكارێكە بۆ زینا و حەرامكردنی ئەو تۆڕینە بە (سد الذريعة) دادەنرێ.

دەتوانرێ بۆ شارەزایی لەسەر ئەو بەڵگانەی ئیختیلافیان تێدایە و ئیمام ئەحمەد حوكمی پێ دەكا یان پێی ناكا، سەیری (اعلام الموقعين والمدخل واصول مذهب الامام احمد) بكرێ.

١٠٠ دەتوانرێ بۆ ئەوە سەیری باسەكانی تایبەت بە تەشەردان لەعلوز (قوادح العلة) و پرسیارەكانی لەسەر قیاس بكرێ.

١٠١ تحقيق المناط: ئەوەیە كە كرۆكی وەسفێك لە وەسفەكانی هۆی حوكمێك بزانرێ، موجتەهید هەوڵ دەدا بۆ زانینی كارێك كە هۆی تێداهەبێ.

بەڵام المناط: خۆی هۆیە، وا ناونراوە چونكە حوكمەكە (هۆدار) دەبێت، كاتێك دەڵێن هۆی برینی دەستی دز، دزی كردنە، واتە بردنی ماڵی غەیر بە نهێنی لە شوێنی پارێزراوی خۆی،



کارکردن بە استحسان بە حەرام دەزانێ و تەنیا کۆرای سەردەمی هاوەڵان بەبەڵگە دادەنێ، کار بە سەنەدی فەرمودەی مرسل و پچڕ پچڕ (المنقطع) ناکا بە پێچەوانەی مالیکی و حەنەفی و حەنبەلی. کار بە (شەرعی پێش خۆمان)یش ناکات. کارکردنیش بە رەئی بۆ کەس بەحەلاڵ دانانێ، چونکە خودای بەرز فەرموویە: ﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ . . .﴾ الانعام: ٣٨ لادان لەو حوکمەی دەقی لەسەر هاتوە بۆ غەیری ئەو، لادانە لە حوکمی خودا، بۆ کەس حەلاڵ نیە بە مەفهومی موخالیف حوکم بکا. لاسا کردنەوە وەك چۆن بۆ زانا حەرامە بۆ خەڵکی ئاسایش حەرامە. لەسەر هەموو موکەلەفێکە ئەو هەوڵە بدا کە دەتوانێ ئیجتهادی پێ بکا.[١٠٢]

## ئێمەش دەڵێین

لە راستیدا زۆربەی ئەو بنەمایانەی دەدرێنە پاڵ ئەو ئیمامانەی خەڵك دوایان کەوتون، لە قسەکانیان دەرهێنراون، راست نی‌یە لەوانەوە ریوایەت بکرێن، مەرایی بۆ کردنیان و بەرگری کردن لێیان و تەکلیفی رەخنەگرتن و وەلامدانەوە و رەتدانەوەی موخالیفەکانیان و سەرقاڵبوون بەهەموو ئەوانە لەبری قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەوانە هەموو دیارترین هۆکاری ئیختیلافی بێ فەڕن کە ئیمامەکان ﷺ خۆیان ئامانجیان ئەوە نەبوە، ئەو ئیختیلافەش موسوڵمانە پاشینەکانی لە کارە بەرزەکان دورخستەوە و بەکاری پوچ و کەم مایە سەرقاڵی کردن، تاکو ئوممەتی سەرە و لێژکرد بۆ ئەو ئاستە نزمەی کە ئەمرۆ تێیدا گینگڵ دەدات.

---

موجتەهید هەوڵ دەدات ئەو شتانە بزانێ کە بە هۆیەوە سیفەتی بردنی ماڵەکە دێنێتە دی. جا گیرفان بڕ و هەڵدەرەوەی قەبر قیاسیان لەسەر دز دەکرێ، چونکە هەریەك لەوانە وەسفی دزین لەسەر کارەکەی دەچەسپێ و هۆیەکەی تێدا دێتەدی.

١٠٢ ئەو بنەمایانەمان لە کتێبی (النبذ والاحکام لابن حزم) کورت کردۆتەوە.

# هۆیەکانی ئیختیلاف لە چەرخی پێغەمبەرێتی تاکو چەرخی فەقیهەکان

ئەگەر دڵنیا بووین کە ئیختیلاف لە سەر کێشە فیکرییەکان -کە کێشە فیقهییەکانیش لەوانن- کارێکی سروشتییە، چونکە خەڵکان بە جیاوازی ئەقل و تێگەیشتن و هوشیاریان لەسەر ئەو سروشتە خولقێنراون، پێویستە پێی نیین کە ئیختیلاف لە چەرخی پێغەمبەرێتی و جێنشینە سەر راستەکان لە نێوان ژمارەیەك لە هاوەڵان رویداوە و کومەڵێك روداویش شایەدی ئەوەن. نەفی کردنی ئەو واقیعە لە خزمەتی دین دا نییە، هەروەك لە باسکردنیشیدا هەست ناکرێ کە زیان بە میسالیەتی ئەو بانگەوازە و راستی نیازی ئەو پیاوانە بگەیەنێ کە ئیختیلافیان هەبووە. بەڵکو دەتوانین بڵێین:

خستنەرووی واقیعیەتی ئەو دینە لە باسکردنی ئەو ئیختیلافانە دایە، وا مامەڵە دەگەل خەڵك دەکا کە ئەوان تەنیا مرۆڤن. ئەو هۆکەلە جۆر جۆرانە بە کێشەیان دێنێت کە خودای بەرز مەخلوقی لەسەر وەدیهێناوە. بەڵام ئەوەی نەفسی ئیماندار دڵنیا دەکات ئەوەیە کە ئەو ئیختیلافانە لە لاوازی عەقیدە یان گومان لە راستی بانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ، سەری هەڵنەداوە. بەڵکو گەران بەدوای هەق و ئارەزووی گەیشتن بەمەبەستی حوکمەکانی یاسادانەر خواستی هەموو موخالیفەکان بوە.

هەر لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ سەرچاوەی ئەو حوکمانە بووە. ئەوا تەمەنی خیلاف هەر ئەوەندە بووە تا گەیشتوتەوە لای پێغەمبەر ﷺ. لە میانەی ئەو روداوانەی تێپەرین زانیمان کە سەرجەم هۆکانی ئیختیلاف لەوە دەرنەچون کە تەنیا جیاوازی بێ لە تێگەیشتنی دەق دا، لەبەر هوی زمانەوانی یان ئیجتهادی. ئەویش لە تەفسیر کردنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، وەنەبی لە پەنا ئەو هویانەش دا هیچ نیازێکی شاراوە هەبێت هەوڵی گەشەپیدانی تووی خیلاف بدا کە مونافیقان رشت

بوون لە سەر پەرەپێدانی، هەر بۆیە کە بە دیداری پێغەمبەر ﷺ دەگەیشتن یان پەنایان بۆ دەقێکی قورئان یان سوننەت دەبرد کەلای هەندێکیان هەبوە و لای ئەوانیتر نەبوە. ئەوا ئەو ئیختیلافانە بەزوویی نەدەمان. چونکە مەبەستی خاوەن فترەی ساغ وەرگرتنی هەقە لە هەر کوێ دەستی کەوێ.

زۆر ئاسایی‌یە کەهەندێك هۆگەلی بابەتی لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی‌تر بگوازرێتەوە چونکە زەحمەتە بتوانرێ بەربەستێك دابنرێ هۆکانی ئیختیلافی هەر سەردەمێك لە پشتەخوی بگری. بەلام هەندێك شت لەگۆرەپانی ئیسلامی سەری هەڵداوە. هۆگەلێکی بەرهەم هێناوە کە ئاگری ئیختیلاف خۆش دەکا.

هەر لە شەهید کردنی خەلیفەی سی‌یەمەوە عوسمان کوری عەففان ﷺ.نشینگە ئیسلامی‌یەکان توشی هەژانگەلێکی توند هاتن، هەندێك روداویان لێکەوتەوە کاروباری دەرەوەی ئیختیلافیان هێنایە نێو بازنەی ئیختیلاف، کە بوە هۆی گۆشەگیری خەڵکی هەر شار و شوێنێك تەنیا لەسەر ئەو سوننەتانەی پێغەمبەر ﷺ کە پێیان گەیشتوە، لەترسی هەڵبەستن و ئالودە بوون، وەك لەپێشەوە ئاماژەمان کرد.

هەردوو قوتابخانەی کوفە و بەصرە وەك ژینگەیەکی پیتدار بۆ کارلێکی فیکرە سیاسی‌یەکان دەرکەوتن و ژمارەیەك تاقمی جۆر جۆری وەك خەوارج و شیعە و مورجیئە[102] و موعتەزیلە و جوهمیە و تاقمی‌تر لەئەهلی ئارەزوبازو بیدعەساز سەریان هەڵدا.

---

١٠٢ المرجئة: ئەوانەن کە گوتەی (الارجاء في الایمان)یان دەدریتە پال. الارجاء: لە زمانەوانی‌دا واتە. التأخیر (دواکەوتن). بەلام لە زاراوەدا. دواکەوتنی کردەوەیە لە ئیمان. هەروەها دەڵێن. سەرپێچی دەگەل ئیمان زیانی نی‌یە. هەروەك فەرمانبەری دەگەل کوفر سودی نی‌یە. ئەوەش خیلافی ئەوەیە کە ئەهلی قیبلەی لەسەرە. دابەشی پێنج تاقم بوون: بۆ ناسینی تاقمەکان و

بەزۆر بوونی ئەو تاقمانە مەنهەجی عەقڵی و فیکری زۆر بوون، تاوای‌لێهات بۆ هەر تاقمێ سەرەتاگەو رێسایەك هەبوو لەماملەڵەیان دەگەڵ دەقەكانی شەرع و تەفسیركردنی سەرچاوەكانی شەرعی و هەڵوێستیان لەو كێشە جیا جیایانەی دەهاتنە ئاراوە، لەو سەرەتاگەو رێسایانەوە دەستیان پێ دەكرد. بۆیە پێویست بوو مەرجگەل و پێوەند دابنرێ و مەنهەج و رێگەكانی هەڵێنجانی حوكمی رووداوەكان لەوەحی خودایی سنووردار بكرێ و ئەوەی ئیختیلاف تێیدا رەوایەو ئەوەشی تێیدا رەوا نی‌یە دیاری بكرێ.

رەنگە لە فەزلی خودای بەرز بێ كە لایەنی فیقهی لە بازنەیەك داناوە ئیختیلاف تێیدا رەوا بێ. ئەوەش چونكە (فیقه) بریتی‌یە لەوەی كە(فقیه) حوكمی ئەو واقیعە بە بەڵگەیەك لە بەڵگەكانی تەفصیلی جزئی بزانێ كە یاسادانەر دایناوە بۆ دەلالەت لە حوكمی ئایەتەكانی قورئان و فەرمودەكانی پێغەمبەر ﷺ. رەنگە فەقیهـ مەبەستی یاسادانەر بپێكێ و دەگەڵی بسازێ یان دەگەڵی نەسازێ. بەڵام لە هەردوو حاڵەتدا داوای لێناكرێ زیاد لەئەوپەری توانای عەقڵی و زەینی بۆ گەیشتن بە حوكمەكەی هەوڵ بدا. ئەگەر نەگەیشتبێتە ئەو ئاستەی حوكمی یاسادانەر پێی گەیشتوە، ئەوە نزیكترین ئاستێتی لە هەقیقەت و مەبەست و شوێنەوارەكەی، لەبەر ئەوە ئیختیلاف كارێكی شەرعی‌یە و ئەوەش لەبەر بونی دوو مەرج تێیدا:

یەكەم: بۆ هەریەك لە موخالیفەكان بەڵگەیەك هەیە دەگونجێ پێی وەربگرێ. ئەگەر بەڵگەی نەبێ ئەوە هەرەس دێنێ و بە ئەسڵ دانانرێ.

---

وتاریان بنوڕە: التبصير في الدين (٩٧) واعتقادات الفرق للرازي (١٠٧ و دوای ئەو) والمواقف لعضد الدين الايجي (٤٢٧-والمتن وحده).

دووەم: وەرگرتن بە مەزهەبی موخالیف سەرنەكێشێ بۆ مەحالْ و بەتاڵ. ئەگەر وابێ هەر لەسەرەتاوە بەتاڵ دەبێ. كەس بۆی نیە لەهیچ بارێك قسەی پێ بكا. بێ ئەو دوو مەرجە (ئیختیلاف) بە (خیلاف) دەگۆردرێ.

ئیختیلاف ئەوەیە كە ئەو دوو مەرجەی تێدا بێ، ئەوەش دیاردەیەكە لە دیاردەكانی روانگەی عەقڵی و ئیجتهادی، هۆكارەكانیشی بە زۆری مەنهەجی و بابەتیانەیە، بەڵام خیلاف ئەوەیە كە هەردوو مەرجی یان یەكێكیانی لەدەست داوە ئەوەش رووەكە لە رووەكانی گرژی و ئارەزووبازی و مل پێچی، هیچ هۆیەكی نیە لەبابەتیانەی نزیك بخاتەوە.

## هۆیەكانی ئیختیلافی فیقهی لە چەرخی فەقیهەكاندا

ئەو فەقیهانەی كە ئوممەت لەسەر كاركردن بەمەزهەبەكانیان یەك دەنگن، رشت بوون لەسەر پابەند بوون بەو دوو مەرجەی پێشەوە، لەو چەرخەدا خەڵكان ئیختیلافێكی ئاشكرایان لە دیاری كردنی هۆگەلی ئیختیلافە فیقهییەكان هەبوو: هەندێك لە باس كردنی ئەو هۆگەلانە تێیان پەراند و هەندێك مام ناوەندی بوون، دەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ ئەو هۆگەلانە بۆ ئەو خاڵانەی خوارەوە بگەرێنرێنەوە:

### ١- هۆگەلێ بۆ زمان دەگەرێتەوە:

وەك هاتنی وشەی هاوبەش لەفەرموودەی یاسادانەر. ئەویش بو مانای فرە و جۆر جۆر دانراوە، وەك وشەی (عین) بۆ بینایی و كانیاو و زێری ساغ و چاودێر و چەند مانایتریش بەكاردێ.

ئەگەر لە وتەی یاسادانەر وشەیەك هاتبوو. رووت بوو لە هەر گرینە (قرینە)یەك، هەرمانایەكیش كە بوی دانرا یەكسان بوو -بەو شێمانەیەی كەدانانی هەركامیان مەبەستە- جا موجتەهیدەكان ئیختیلافیان لەسەر ئەو مانایە دەبێ كە وشەكە هەڵیدەگرێ، یان لەسەر هەموو ماناكانی.

فەقیهەکان لە وشەی (القُرْءْ) لەئایەتی: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ﴾ البقرة: ٢٢٨ ئیختیلافیان لە مەبەستی یاسادانەر هەبووە. وشەی (القُرْءْ) هاوبەشە لەنێوان پاکی و بێنوێژی (حەیز)دا، فەقیهەکان سەبارەت بە ماوەی مانەوە (عیدە)ی تەلاقدراو ئیختیلافیان هەبووە. ئایا ماوەکە بە بێ نوێژییە یان بەپاکبونەوەیە؟ لەو نێوەدا -حیجازییەکان رایان وایە کە عیدەی تەلاق دراو سێ پاك بوونەوەیە. ئیراقییەکانیش رایان وایە سێ حەیزە.[104]

هەندێك جار وشەیەك بۆ دوو مانا بەکار دێ: هەقیقی و مەجازی، جا ئیختیلافیان لەوە دەبێ کەئایا ئەم وشەیە لە دەقەکانی یاسادانەر بۆ کامە مانا بەکار هاتووە. هەر لەسەرەتاوە رەوادانی بونی مەجاز بۆ وشەی یاسادانەر مایەی ئیختیلافی زانایان بوە، زۆربەیان مەجازیان سەلماندوە و کەمێکیان نەفییان کردووە، وەك مامۆستا ابی ئیسحاق الاسفراییني و شیخ الاسلام ئیبن تیمیە.

ئەوانەی نەفیان کردووە بەڵگەیان ئەوەیە کە مەجاز بەکارهێنانی وشەیە بۆ غەیری ئەو شتەی -لەئەسڵ دا- بۆی دانراوە. وەك بەکارهێنانی وشەی (شێر) بۆ وەرەی پیاوی ئازا، دەقەکانی یاسادانەر بۆ روونکردنەوەی حوکمەکانی شەرعی هاتون. بەکارهێنانی بۆ شتێکی غەیری ئەوەی بۆی دانراوە پێچەوانەی روونکردنەوەی مەبەستە، لێرەدا مەبەستمان گوتوبێژی ئەو بابەتە نییە. جەماوەری زانایان رایان وایە مەجاز لە وشەی یاسادانەردا هاتوە، ئیبن قدامە و غەیری ئەو لە ئوصولییەکان نکولی کردنی بوونی مەجاز لە دەقەکانی یاسادانەر بە جۆرێك لە خۆبەزل زانی دادەنێن[105] بەپێی ئەمە زانایان لە تێگەیشتنی مەبەستی وتەی یاسادانەر ئەگەر بە شێوەیەکی رارایی لە نێوان هەقیقەت و مەجازدا هاتبێ.

---

١٠٤ تفسیر القرطبي (١١٣/٣) والمغني لابن قدامة (٧٧/٩ و دوای ئەو).

١٠٥ بڕوانە: روضة الناظر (٣٥) ط. السلفية.

ئیختیلافیان دەبێ. یان تاکە وشەیەك هاتووە دووشیمانە هەڵدەگرێ.هەندێك بەمانای هەقیقی و هەندێك بەمانای مەجازی تێدەگەن. وەك وشەی تەرازو (المیزان) کە لە هەقیقەتدا ئەو ئامێرەیە خەڵك شتی پێدەکێشێ، لە مەجازیشدا بۆ داد (العدل) بەکاردەهێنرێ. خودای بەرز دەفەرمووێ: ﴿وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ، أَلاَّ تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ، وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلاَ تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾ الرحمن: ٧-٩

میزان لە یەکەم و دووەم دا بۆ (داد) بەکارهاتووە. هەروەك خودای بەرز دەفەرمووێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ الحديد: ٢٥ لە سێیەم دا مەبەست پێی مانا بەرهەستەکەیە کە ئەو ئامێرەیە شتی پێ دەکێشرێ[١٠٦]. هەروەك بە عەرووز دەگوترێ (کێشی شیعر)و بە (نحو)ش (کێشی ئاخاوتن-میزان الکلام)[١٠٧] وشەی (السلسلە)و غەیری ئەویش وان.

هەندێك جاریش مەجاز لە رستەیەك دا هەیە، وەك لە فەرموودەی خودای بەرز: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاساً يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشاً﴾ الأعراف: ٢٦

ئاشکرایە پۆشاك بە پۆشاکی لە ئاسمان دانابەزێ. زینەت و پەڕیش بەهەمان شێوە. بەڵام خودای بەرز بارانی باراند و روەکی رواند و ئاژەڵی وەدیهێناو خوری و توك و کورکی بەبەرداکردن. لۆکە و کەتانی رواند تا پۆشاکی لێ دروست بکرێ. جا شتەکە دراوەتە پاڵ هۆکارەکە (پۆشاك) لە بری هۆیەکە ئەویش ئاوە، کە خودای بەرز هەموو شتێکی زیندوی لێ وەدیهێناوە.

---

١٠٦ تفسير ابن كثير (٤/٢٧٠).

١٠٧ التنبيه (٥٥).

رونه كه دارشتەی (بكه) بۆ كردنه و (مەكه) بۆ نەكردنه، كردنی موتڵەق بۆ واجب بوونه، نەكردنی موتڵەقیش بۆ حەرام بونه. ئەوه بەكارهێنانی هەقیقیيه بۆ هەردوو دارشتەكه، بەڵام جار وايه هەردووكيان بە مانايەكیتر دێن غەیری ئەو مانايەی يەكەم جار بۆی دانراوه.

وادەبێ (فەرمان) بۆ پەسەندی و سوننەته، وەك فەرمووده‌ی خودای بەرز: ﴿فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً﴾ النور: ٣٣ يان بۆ ڕێرونیيه وەك فەرموودەی: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ. . .﴾ يان فەرموودەی: ﴿إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ﴾ البقرة: ٢٨٢

يان بۆ هەڕەشەيه وەك فەرموودەی: ﴿اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ﴾ فصلت: ٤٠ غەیری ئەوانەش.[١٠٨]

هەروەها (نەهی) وادەبێ بۆ غەیری حەرامی بێت وەك بۆ ناپەسەندی و بە سوك زانين، خودای بەرز دەفەرمێ: ﴿لاَ تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ﴾ الحجر: ٨٨

يان بۆ ڕێرونیيه، وەك فەرموودەی: ﴿لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ المائدة: ١٠١ غەیری ئەويش.[١٠٩]

هەروەها (فەرمان) بە شێوازی هەواڵ دێ، وا دەبێ (نەهی)يش بە شێوازی هەواڵ و نەفی دێت. هەموو ئەوانە لە ئیختیلافی فەقیهەكان و ڕێگەكانيان و

---

١٠٨ سەيری: لێكۆڵينەوەمان بكه لەسەر: المحصول (١/ق٢/٧٥ و دوای ئەو) وقد اورد خمسة عشر معنى ترد لها صيغة: افعل.

١٠٩ سەرچاوەی پێشوو (٤٦٩) والاحكام للامدي (١٨٧/٢) ط. الرياض.

هەڵێنجانی حوکمی شەرعی لە دەقەکاندا شوێنەواریان هەیە. هەندێك جار مەزهەب زانایان لە تێگەیشتنی دەق بە جیاوازی باری ئەو وشەیەی تێیدا هاتوە جیاوازیان دەبێ. ئەگەر ماناشی جیاواز نەبێ، وەك ئیختیلافیان لە فەرموودەی: ﴿ وَلَا يُضَارَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ ﴾ البقرة: ٢٨٢ هەندێك بۆ ئەوە چونە کە مەبەست پێی دەرچونی زیانە لە نووسەر و شایەت، ئەمەش لەو کاتەی نووسەر شتێك دەنووسێ کە پێی نەگوتراوە، شایەتیش بە پێچەوانەی واقیعەکە شایەتی دەدات. بەڵگەی ئەوانە خوێندنەوەی (ئیبن عەباس)ە ﷺ: ﴿ وَلَا يُضَارِرْ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ ﴾.

هەندێکی‌تر بۆ ئەوە چونە کە مەبەست زیان دانە لە نووسەر و شایەت، وەك لە کاریان دەخەن و لە کاتێکی نەگونجاو (پڕ کار) تەکلیفی نووسین و شایەتیان لێ دەکەن، بەڵگەی ئەمانیش خوێندنەوەی (ئیبن مەسعود)ە ﷺ ﴿ وَلَا يُضَارَرْ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ ﴾ کاتێ وشەکە بە لەهجەی (تمیم) تێهەڵکێش (ادغام) بکرێ، لەوانەیە فەرمانەکە بۆ دیار یان نادیار بگەڕێتەوە، جا ئەو ئیختیلافە روو دەدا، ئەگەرچی کردنەوەی تێهەڵکێش (فك الادغام) لەهجەی ئەهلی حیجازە.[110]

شوێنکەوتەی ئەو جۆرە هۆکارانەی ئیختیلاف، نمونەی زۆری دەست دەکەوێ لە وشە تاکەکان و جۆرەها رستەی جیا جیا و ئەو شوێنەی -گشتێتی و تایبەتێتی، موتڵەق و موقەید و (کۆکردنەوە و روونکردنەوە-اجمال و بیان) و غەیری ئەوانەش داوێن گیری دەبێ... رەنگە ئەوەی باسمان کرد وریامان بکاتەوە لەوەی لێی غافل بوینە و دەکرێ لە شوێنی خۆیدا پەی پێ ببەین.[111]

---

١١٠ بنوڕە: التنبيه على اسباب الاختلاف (٣٢-٣٣).

١١١ نحو كتاب ابن السيد البطليوسي (التنبيه على الاسباب التي اوجبت الاختلاف بين المسلمين) و كتاب ابن تيمية (رفع الملام عن الائمة الاعلام).

## ٢- هۆ گەلێ بۆ ریوایەت کردنی سوننەت دەگەرێتەوە:

ئەو جۆرە هۆگەلانە فرە لایەن و شوێنەواری جیا جیایان هەیە، زۆربەی ئیختیلافی فیقهی زانایانی پێشین بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە هەندێك جار فەرمودەیەك بە موجتەهیدێ ناگات، ئەویش بەپێی رواڵەتی ئایەت یان فەرمودەیەکی‌تر یان قیاس لەسەر مەسەلەیەك کە پێشتر پێغەمبەر ﷺ حوکمی پێ داوە یان بە پێی استصحاب بۆ حاڵەتێکی پێشتری[112] یان بە پێی (ئەسڵی هەموو شت بێ تاوانی و نەبوونی تەکلیفە)[113] یان بە گوێرەی هەر روویەك لە رووە موعتەبەرەکانی ئیجتهاد فەتوا دەدات.

وا دەبێ سەبارەت بە هەمان روداو فەرمودەیەك بە موجتەهیدێکی‌تر دەگات، بە پێی ئەو فەرمودەیە فەتوا دەدات و فەتواکەیان جیاواز دەبێت.

جار هەیە فەرمودەیەك بە موجتەهیدێك دەگات، بەلأم هۆیەکی تێدا دەبینێ وای لێ دەکا بە پێی ئەو کار نەکات، وەك باوڕنەبوون بەڕاستی سەنەدەکەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەبەر بوونی نادیارێك یان تاوانبارێك یان جوان لەبەر نەبوونی زنجیرەی ئیسنادەکەی یان لەبەر پچرانی یان مورسەلێتی، یان ئەوەتا لە هەواڵی تاکە کەسێدا دادگەری و پارێزەری بەمەرج دادەنێ، مەرجگەلێ رەنگە غەیری خۆی داینەنێ. یەکێکیان بەو فەرمودە کاردەکا، چونکە رێگەیەکی راستی نەپچراوی لا هەیە، بەلأم ئەویتر بەپێی ئەوە کارناکا لەبەر یەك لەو هۆگەلانەی باس کران، بۆیە رایەکان لێك جیا دەبن.

---

١١٢ استصحاب الحال: دانانی حوکمی نەگۆڕی رابرد و بەردەوام تاکو ئێستا، لەبەر دڵنیا نەبوون لە گۆڕانی یان مانەوەی بەو شێوەیەی کە پێشتر لەسەری بوو.

١١٣ ئەسڵ نەبوونی تەکلیف و خاڵی بوونی ئەستۆی بەندەیە لە تەکلیفەکان، لەبەر ئەوەی تەکلیف نییە مەگەر بە بەڵگە نەبێ.

یا خود گوتەی زانایان، بە راجیایی لەسەر مانای فەرموودە و مەبەستەکەی جیاواز دەبێ، وەك راجیایی لە مەسەلەکانی (المزابنة)[114] و (المخابرة)[115] و (المحاقلة)[116] و (الملامسة)[117] و (المنابذة)[118] و (الغرر)[119] لەبەرجیاوازیان لە تەفسیرکردنیاندا.

یا خود فەرموودە بە رستەیەکی جیا لە رێگەیەکەوە بە موجتەهیدێك دەگات و بە رستەیەکیتری جیاواز بە موجتەهیدێکیتر دەگات. ئەوەش وەك ئەوەی یەکێکیان برگەیەکی لەفەرموودەکە لانەبێ و مانای فەرموودەکەش بەو برگەیە نەبێ تەواو نابێ یان مانای فەرموودەکە بە لاچوونی برگەکە دەگۆڕێ.

یا خود فەرموودەیێك و زانینی هۆی هاتنیشی بە موجتەهیدێك دەگات و لە مەبەستی چاکتر حاڵی دەبێت، بەڵام هۆی هاتنی بە یەکێکیتر ناگات، کەواتە تێگەیشتنی ئەو جیاواز دەبێت.

لەوانەیە راوییەك بەشێکی فەرموودەیەك دەبیستێ، راوییەکیتر تەواوی فەرموودەکە دەبیستێ، یا خود فەرموودەیەك بە وتەی جیاواز یان گۆڕاو لە کتێبێك

---

114 المزابنة: لە زمانەوانیدا: پاڵ پێوەنان (لە کۆڵ خۆ کردنەوە). لە زاراوەی ئەهلی زانستدا: فرۆشتنی رووتاب بە خورما هەریەدارەوە، فرۆشتنی تری بە مێوژ، فرۆشتنی تەبارە بە گەنمی کێشراو، لای هەندێکیان مەبەست لە (مزابنة) کشتوکاڵە. بنۆڕە: القاموس الفقهي (١٥٨).

115 المخابرة: موڵکدار زەوی دەداتە جوتکار دایچێنێ لەبری پێدانی هەندێك لە داهاتەکەی، یان کارکردنە لە زەوییەك لەبری هەندێك داهاتی.

116 المحاقلة: فرۆشتنی چێنراو پێش پێگەیشتنی.

117 الملامسة: فرۆشتنێکە لە نەفامی هەبوو، بەم شێوەیە: هەر کە کریار دەستی بەر فرۆشراو بکەوێ، تەنیا دەست لێدانی بێ پشکنین و بڵاوکردنەوەی بە بڕیاری فرۆشتن دادەنرا. زۆر جار بە لێخشانی پۆشاك دەبوو.

118 المنابذة: وەك کەسێ کراسەکەی بە کراسی کەسێ بفرۆشێ، یان بە نرخەکەی، تەنیا دانانی کراسەکە بڕیاری فرۆشتنە.

119 الغرر: فرۆشتنی ئەو شتەی بوون و نەبوونی نازانرێ، یان کەمی و زۆری دیارنییە، یان ناتوانرێ بدرێتە دەست کریاری.

دەگوازرێتەوە و لە سەری حوکم دەکا، ئەویتر بە وتەیەکی بێ جیاواز و گۆڕان دەیگوازێتەوە، لەسەر ئەو بناغەیە رایەکان جیاواز دەبن. لەوانەیە فەرمودەیەك لای موجتەهیدێك راست بێت بەڵام پێی وایە ئەوە دژی فەرمودەیەکی لەو راستتر یان بەهێزترە، بەهێزەکە بە چاکتر دادەنێ، یان بەڵگەی بەهێزی لە هیچیان بۆ دەرناکەوێ، لە وەرگرتن بە هەردووکیان رادەوەستێ تاکو بەهێزترینی بۆ دەردەکەوێ.

وادەبێ موجتەهیدێك ناسخی فەرمودەیەك دەدۆزێتەوە یان گشتییەك تایبەت دەکاو موتڵەقێك موقەیەد دەکا، موجتەهیدێکیتر ئاگاداری هیچ شتێك لەوانە نابێ، کەواتە بۆچونیان جیاواز دەبێ.[120]

### ٣- هۆکەلێ بۆ بناغە ئوسولیەکان و مەرجەکانی هەڵێنجان دەگەڕێتەوە:

زانستی ئوصولی فیقهـ بریتییە لە ناسینی بەڵگەی فیقهی بە شێوەیەکی چڕوپڕو ئیجمالی و چۆنیەتی سودوەرگرتن لێی و باری سود وەرگر *.

ئەو زانستە بریتییە لە کۆی ئەو بنەما و زەوابتانەی کە موجتەهیدەکان دایانناوە بۆ وەرێخستنی کرداری ئیجتهاد و هەڵێنجانی حوکمە شەرعیە فەرعیەکان لە بەڵگە تەفصیلییەکانیان. موجتەهیدەکان لە مەنهەجە ئوصولیەکانیاندا ئەو بەڵگانە دیاری دەکەن کە حوکمیان لێ وەردەگیرێ. بیانو بۆ بە بەڵگە دانانی هەر یەکێکیان دەهێننەوە. هەموو کۆسپە زاتیەکانی ئەو بەڵگانە نیشان دەدەن تا رێگەی سود وەرگرتنی حوکمەکان لەو بەڵگانە روون و ئاشکرا بێت و رێگەی سود وەرگرتنی حوکمی شەرعی لە هەر بەڵگەیەك لەو بەڵگانە و ئەو هەنگاوانەی کە لە سەرەتاوە دەیگرنە بەر تا گەیشتن بە حوکمی شەرعی، دیاری دەکەن. مەزهەبی

---

١٢٠ بنۆرە: رفع الملام (٧) المكتب الاسلامي.

* معرفة ادلة الفقه على سبيل الاجمال، وكيفية الاستفادة منها، وحال المستفيد.

موجتەهیدەکان لەو بناغەو زەوابتانەدا جیاوازبوون: جیاوازیش لەوانەدا، جیاوازی مەزهەبەکانی فیقهی لێکەوتەوە، کە هەر یەکێکیان بۆچونێکی هەیە، هەندێك ئیمام رایان وایە فەتوای هاوەڵان ئەگەر مەشهور بێ و موخالیفی -لە خودی هاوەڵان- نەبێ بە بەڵگە دەشێ. چونکە لە متمانە بە دانگەری هاوەڵ وا مەزندە دەکرێ کە هیچ فەتوایەکی نەدابێ مەگەر لەسەر بناغەی بەڵگە یان تێگەیشتنی لە بەڵگە نەبێ. یان لە پێغەمبەری ﷺ بیستوە، کە مەشهور نەبووە و بە ئێمەش نەگەیشتوە. هەندێکیان فەتوای هاوەڵان بەو رایە وەرناگرن، بەڵکو ئەو رایەی کە هاوەڵ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەتی کردووە بە بەڵگە دادەنێن. نەك ئەو رایەی خۆی بۆی چوە. لەبەر ئەوە مەزهەبی فەقیهەکان جیاواز دەبێ. هەندێك لە موجتەهیدەکان بە (المصالح المرسلة) بەرژەوەندی نێرەر وەردەگرن، واتە: ئەو کارەی لە شەرع دا راستەوخۆ بەڵگەی بە رەوا دانرانی نی یە و هەروەك راستەوخۆش بەڵگەی وەلانرانی نەهاتوە. ئەوە نێرەر (مرسلة)ێکە موتڵەقە لە دانرانی یان وەلانرانی. ئەگەر موجتەهید زانی ئەو کارە بەرژەوەندی دەست دەخا، بە پێی ئەو بەرژەوەندی یە فەتوا دەدا بەو بیانوەی کە یاسادانەر حوکمێکی دانەناوە مەگەر بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی بەندەکانی نەبێ. هەندێکی‌تر بەوە وەرناگرن و بە کارێکی وای نابینن سودی بۆ حوکمەکان هەبێ، لەبەر ئەوە رایان لەسەر روداوەکان جیاواز دەبێ.

کاروباری‌تر -لەوجۆرە- هەن، موجتەهیدەکان تێیان دا جیاوازن، لە کتێبەکانی ئوصولی فیقهـ دا بە (بەڵگەکانی ئیختیلاف لەسەر-الادلة المختلف فيها) ناسراون، وەك: (سد الذرائع) و (الاستحسان) و (الاستصحاب) و (الاخذ بالاحوط) و (الاخذ بالاخف) و (الاخذ بالاثقل) و (العرف) و (العادة) و هتد...

هەروەها ئیختیلاف هەیە لە هەندێك كاروباری پەیوەست بە دەلالەتی دەقەكان و ڕێگەی دەلالەتەكان و ئەوەی لەوانەوە پێی وەردەگیرێ. لە هەموو ئەوانەدا ئیختیلافاتی فیقهی لە زۆربەی كارە فەرعیەكانیاندا دروست بوە.

ئەوانەبوون گرنگترین و دیارترین هۆكار كەدەبونە مایەی ئیختیلافاتی فیقهی. بە كورتی ئاماژەمان بۆ كردون. ئەو كەسەی درێژترو چڕو پڕتری دەوێ و دەیەوێ هەموو هۆكارەكان یان پوختە و گرنگەكەیان بە نمونەوە بزانێ. بابگەڕێتەوە بۆ ئەو كتێبانەی كە ئێستا و ڕابردو بۆ چارەسەری ئەو كارانە دانراون.[121]

121 بڕوانە: نزهة الاولیاء (٣٩٢) و دائرة معارف القرن العشرین (٤/١٤١).

ئیمامەکان لە زۆر کاروباری ئیجتهادیدا ئیختیلافیان هەبوو، هەروەك هاوەڵان و تابعییەکانیش ئیختیلافیان هەبووە. چونکە ئیختیلافی ئەوان لە هەوا و ئارەزو و مەیلی دووبەرەکی سەری نەگرتبوو، بەڵکو هەمویان لەسەر راستە ڕێ بوون. هەریەك لەوان هەرچەند لە توانای دابوو کوششی دەکرد بۆ ئەوەی ئامانجی لە تەنیا گەیشتن بەحەق و رەزامەندی خودای گەورە شتێکیتر بێ. لەبەر ئەوە ئەهلی زانست لە هەموو چەرخەکاندا، فەتوای موفتییە شایستە و کارامەکانیان لەمەسەلە ئیجتهادییەکاندا وەردەگرت. راستی پێکاویان بە راست دادەنا و داوای لێخۆشبونیان بو بە هەڵەداچوان دەکرد و گومانی چاکیان بە هەمووان دەبرد، ملکەچی حوکمی قازییەکان دەبوون لەسەر هەر مەزهەبێك بونایە، لە کاتی پێویستدا قازییەکانیش پێچەوانەی مەزهەبی خۆیان کاریان دەکرد، بۆ ئەوەی هەست بە دڵتەنگی بکەن یان لەسەر رایەکی تایبەت پێداگربن. هەموویان بە جیاوازی بەڵگەکانیشەوە، لەسەرچاوەیەکەوە هەڵیاندێنجا. بە زۆریش رای پەسندی خۆیان بەو جورە گوتانەی، وەك: (ئەوە گونجاو ترە) یان (چاکترە) یان (ئەوەی پێویستە بیێ) یان (لامان ناپەسندە) یان (بەدڵم نییە) رادەگەیاند بی تەنگەتاو کردن و تۆمەتبار کردن. هیچ رایەك وەلا نەدەنرا کە دەقێك پاڵپشتی بوایە، بەڵکو بۆ بەرێوەبردنی کاروباری خەڵك بۆیان سوك و ئاسان و فراوان دەکرا.

لە نێو هاوەڵان و تابعییەکان و دوای ئەوانیش هەبوو (بسم الله الرحمن الرحيم)ی دە نوێژدا دەخوێندەوە و هەیانبوو نەیدەخوێندەوە، تیپاندابوو بەدەنگ و هەیانبوو بە نهێنی دەیگوت. هەبوو لە نوێژی بەیانیدا قنوتی دەخوێند. هەبوو نەیدەخوێند، هەیانبوو لە خوێن پژانی لوت و رشانەوە و کەڵەشاخ گرتن دەستنوێژی دەشوشتەوە، هەیانبوو لەوانە نەیدەشوشتەوە. هەیانبو رای وابوو دەست کەوتن لە ئافرەت دەستنوێژ ناهێڵی و هەیانبوو رای وانەبوو. هەیانبوو لە خواردنی گۆشتی

حوشتر یان ئاگر بەرکەوتن، بەرکەوتنێکی راستەوخۆ، دەستنوێژی دەشوشتەوە، هەیانبوو پێی وانەبوولەوەدا شتێك هەبێ. ئەوانە هەموی نەبونە مایەی ئەوەی هەندێکیان لە دوای هەندێکیتر نوێژ نەکەن، هەروەك ئەبو حەنیفە و هاوەڵەکانی و شافیعی و ئیمامەکانیتر نوێژیان لە دوای ئیمامەکانی مەدینە (مالیکی و ئەوانیتر) دەکرد، ئەگەرچی نە بە نهێنی و نە بە ئاشکرا پابەندی خوێندنەوەی (بسم الله) نەبوون. ئەلرەشید کەڵەشاخی گرت و پێشنوێژی کرد، ئیمام ئەبو یوسف لە دوای نوێژی کرد، نوێژەکەشی دوبارە نەکردەوە، هەرچەندە کەڵەشاخ گرتن لای ئەو دەستنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. ئیمام ئەحمەدی کوری حەنبەل لە خوێن پژانی لوت و کەڵەشاخ گرتن رای بە شوشتنەوە بوو. لێیان پرسی: ئەگەر ئیمام خوێنی لەبەر رۆیی و دەستنوێژی نەگرتەوە، نوێژی لەدوا دەکەی؟ فەرموی: چۆن نوێژ لە دوای مالیك و سەعیدی کوری موسەییەب ناکەم.[122] شافیعی (رەحمەتی خودای لێبێ) نوێژی بەیانی لە نزیك گۆری ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێبێ) کرد و قنوتی نەخوێند -هەرچەندە قنوت لای ئەو سوننەتی موئەکەدە- لەو بارەوە لێیان پرسی: فەرمووی: (من وام لە خزمەتی چۆن موخالەفەی بکەم) هەروەها فەرمووی: (رەنگە مەیلمان دابێتە مەزهەبی ئەهلی ئیراق)[123].

لەو ئیمامانەی فەرمودەی پێغەمبەریان ﷺ لە مەدینەیی‌یەکانەوە وەرگرتوە،ئیمام مالیك چەسپاوترینیانە و ئیسنادی لە هەمویان پتەوتر بووە و شارەزاترینیان بووە لە حوکمەکانی ئیمام عومەر و رایەکانی عەبدوڵڵای کوری عومەر و دایکە عائشە و هاوەڵانیان لە حەوت فەقیهەکان رضوان الله علیهم أجمعین. بە هۆی ئەو و پیاوانی وەك ئەو زانستی ریوایەت و فەتوا سەری هەڵداوە. فەرمودەی هێناوە و فەتواشی

---

122 ئاماژە بۆ ئەوەیە کە هەردوو ئیمام - مالیك و کوری موسەییەب- رایان وایە خوێن بەربون دەستنوێژ ناشکێنێ.

123 حجة الله البالغة (٣٣٥).

داوه ﷺ. کتیبی (الموطأ)ی نوسیوه کە تییدا نیازی هینانی فەرمودە بەهیزەکانی ئەهلی حیجاز بووە، هەروەها لە رای هاوەلان و فەتوای تابعیەکان کامەیانی لا چەسپاوتر بووە هیناویەتی و کردویەتە چەندین دەرو (باب) لە دەروەکانی فیقهـ و زۆرچاك و تەواو ریکی خستوە. (الموطأ) بە بەرهەمی کوششی چل سالەی ئیمام مالیك دادەنری، ئەوە یەکەم کتیبی فەرمودە و فیقهـ بووە لە ئیسلام دا نوسراوە. حەفتا زانای هاوچەرخی لە زانایانی حیجاز بە ناوەرۆکی رازی بونە، دەگەل ئەوەشدا کاتیك مەنسور ویستی چەند نوسخەیەکی لێ بنوسیتەوە و پەخشی شارانی بکا و خەلك ناچار بکا بۆ بنبری خیلاف پەیرەوی ئەو فیقهە بکەن کە تییدایە. ئیمام مالیك یەکەم کەس بوو رەتی کردەوە، لێی دەگیرنەوە فەرموی: (ئەی میری باوڕداران، ئەو کارە مەکە، خەلك پێشتر گوتەی پێگەیشتوە و فەرمودەیان بیستوە، ریوایەتیان کردوە.هەر قەومێك ئەوەی وەرگرتوە کە پێشتر پێی گەیشتوە و ئیختیلافی خەلکیان گەیشتوتێ. واز بینە لە خەلك و لەوەی خەلکی هەر شارێك بۆ خۆیان هەلبژاردوە. خەلیفە دەلێ: خودا سەرکەوتوت بکا ئەی باوکی عەبدوللا)[124].

ئەو ئیمامە پاکە چ پیاوێ بووە کە رازی نەبووە خەلك ناچار بکرین پەیرەوی ئەو کتیبەی بکەن کە چاکترینی ئەو سوننەتەی بیستویەتی و بەهێزترین شتێ کە لەبەریکردوە تییدا داناوە و گەیشتوتە ئەو ئاستەی لای ئەهلی مەدینە و ئەو کۆمەلە زانایەی هاوچەرخی هیچ ئیختیلافی تیدا نەبووە.

## نامەی لەیسی کوری سەعد بۆ ئیمام مالیك

رەنگە چاکترین و جوانترین نمونەی ئەدەبی ئیختیلاف ئەو نامە زانستی و نایابە بێ کە فەقیهـ و زانای مصر لەیسی کوری سەعد بۆ ئیمام مالیکی ناردوە. بە

---

124 سەرچاوەی پیشو (٣٠٧) والفكر الاسلامي (٣٢٦/١).

ئەدەبێکی پوختی بەرز بیروڕای خۆی تێدا خستۆتە ڕوو سەبارەت بە زۆر لەو شتانەی ئیمام مالیك بۆی چوە و لەیسی کوڕی سەعد موخالیفیەتی. لەبەر درێژی نامەکە تەنیا چەپکێکی لێ دەچنین کە ئاماژەی تێدایە بۆ ئەو ئەدەبە بەرزەی لە سێبەری دا پێشینی ئەو ئوممەتە و زانا بەڕێزەکانی ئیختیلافیان بووە. لەیسی کوڕی سەعد دەڵێ: (...سلاوت لێ بێ، سوپاس و ستایش بۆ خودا، کە هیچ پەرستراوێ نی‌یە بێجگە لەو، پاشان: خودا هەردوولامان ببەخشێ و ئاکامی دونیا و دواڕۆژمان چاکتر بکا، نوسراوتم پێ گەیشت باسی حاڵسازی ئێوەی تێدابوو دڵشادی کردم، خودا بۆتانی بەردەوام بکاو بە یارمەتی دانتان لەسەر سوپاسگوزاری و زیادکردنی چاکەکانی، تەواوتری بکا، ... پاشان دەڵێ: (پێت گەیشتووە کەمن فەتوا بە جۆرێك بۆ خەڵك دەدەم جیاوازە لەوەی خەڵکی لای ئێوە لەسەریەتی. مەقمە لە نەفسی خۆم بترسم چونکە لە فەتوا دانمدا بۆیان پشت بەوانەی پێش خۆم دەبەستم. خەڵکی شوێنکەوتەی ئەهلی مەدینەن کە کۆچی بۆکرا و قورئانی لێ دابەزی. بەوەی کە نوسیبوت ڕاستیت پێکاوە -ان شاءالله- منی بەو شوێنە گەیاند کە پێت خۆش بوو. کەس شك نابەی -زانستی درابێتە پاڵ- وەك من بێزار بێ لەو کەسەی فەتوای شاز دەردەکا و وەك من بەڕێزتر بێ بۆ زانایانی ڕابردوی ئەهلی مەدینە و وەکو من فەتوایان وەرگرێ لەو شتەی لەسەری کوك بوونە. سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری بێ هاوتا).

ئیمام لەیس لە نامەکەی‌دا بە هێنانەوەی لایەنەکی ئیختیلافی نێوان خۆی و ئیمام مالیك ﷺ سەبارەت بە بەڵگە دانانی کردەوەی ئەهلی مەدینە بەردەوام دەبێ، ئەوەش ڕون دەکاتەوە کە پێشەنگانی یەکەمین ئەوانەی دەرچوی قوتابخانەی پێغەمبەریتی بوون، ئەو شتەی لە کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ فێری بوون بە هەوڵی خۆیان بەرەو خۆرهەلات و خۆرئاوای زەوی بردیان، لە نامەکەی دا دەری

بریـوه کـه تابعی‌یـه‌کان و دوای ئـه‌وانیش لـه زۆر شـت ئیختیلافیـان بـووه وینـه‌ی: ره‌بیعه‌ی کوڕی ئه‌بی عه‌بدوره‌حمان -هه‌ندێك شت که به دڵی نه‌بوو تێیـدا بـاس ده‌کا- پاشان ده‌ڵێ: (ده‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا -سوپاس بۆ خـودا- ره‌بیعـه خـێری زۆر و عه‌قڵی ره‌سه‌ن و زمانی پاراو و چاکه‌یه‌کی دیار و روون و رێگه‌یه‌کی چاکی ئیسلام و خۆشه‌ویستی‌یه‌کی راسته‌قینه‌ی بۆ براکانی به گشتی و بۆ ئێمه به تایبه‌تی لا هـه‌بوو (رحمه الله وغفر له وجزاه باحسن ما عمله). پاشان باسی نمونه‌ی ئیختیلافی نێوان خۆی و ئیمام مالیك لـه زۆر مه‌سـه‌له‌دا ده‌کـا، وه‌ك: کۆکردنـه‌وه‌ی (نوێـژ) له‌شـه‌وی باراناویدا -حوکم دان به شاهیدێك و سوێندێك- وه‌رنه‌گرتنی پاشه‌کی ماره‌یی ته‌نیا له کاتی جیابونه‌وه‌دا نه‌بێ -نوێژ وه‌پێش وتار خستن له نوێژمبارانه‌دا- مه‌سه‌له‌گه‌لی تریش، پاشـان لـه کۆتـایی نامه‌کـه‌ی دا ده‌ڵـێ: (... زۆر شـتی لـه‌و چه‌شـنه‌م بـاس نه‌کردوه، حه‌ز ده‌که‌م خودا سه‌رکه‌وتووت بکا و مانت درێژکا، تکاکارم له‌وه‌دا سودی خـه‌ڵکی تێدابـێ، ده‌ترسـم ئه‌گـه‌ر تـۆ بـڕۆی لێمـان بشـێوێ، ده‌گـه‌ڵ هۆگریـم بـۆ شـوێنه‌که‌ت هه‌رچـه‌نده دوره مـاڵی، دڵنیابـه ئه‌وه‌یـه پایـه‌ی تـۆ لای مـن و رای مـن به‌رامبه‌رت. له نامه‌که‌ت دا هـه‌وال و حـاڵی خۆت و منداڵ و خێزانه‌که‌تم لێ مه‌بره، چ پێویستی‌یه‌کیشت هه‌یه بۆ خۆت یان بۆ که‌سانی نزیکت ئاماده‌م و به‌وه زۆر دڵشـاد ده‌بم. له کـاتی نوسینی ئـه‌م نامه‌یـه سـوپاس بـۆ خـودا ئێمـه سـاغ و سـه‌لامه‌تین، داواکارین لـه خـودا سوپاسگوزارمان بکا لـه‌وه‌ی پـێ‌ی داوین و ئـه‌وه‌ی بـه نیعمـه‌ت پێ‌ی به‌خشیوین بۆمان ته‌واوتربکا، والسـلام علیکم ورحمة الله).[125]

کتێبـه‌کانی سه‌رگوزه‌شـته و مێـژوو و مونـازه‌رات... هتـد بـه زۆر لـه گوتوبێـژی زانستی وردی تژی ئه‌ده‌بی ئیختیلاف رازاونه‌تـه‌وه، مرۆڤ هیـچ کات له نێو ئـه‌هلی زانست ئه‌ده‌بی (ئیختیلاف)ی لێ ون نابێ، ته‌نیا دوای په‌ره‌سه‌ندنی لاسا کردنه‌وه و

١٢٥ بۆ ته‌واوی نامه‌که بنوڕه: اعلام الموقعین (٣/٨٣-٨٨) و الفکر السامی (١/٣٧٠-٣٧٦).

دەمارگیری و هەڵەنگوتن نەبێ لە رەوشت و روانگەی ئەهلی زانست بۆ خودی زانستەکە، بە تایبەتی دوای ئەوەی گۆرەپان چۆڵ بوو لە وێنەی ئەو زانایانەی ئیمام غەزالی دەربارەیان دەڵێ: (لە زانایانی تابعی مابوون کە بەردەوام بوون لە سەر شێوازی پێشەنگان و پەیوەست بوون بە پاکێتی دین و پاراستنی رێبازی زانایانی (سەلەف)، ئەوان ئەگەر داوا دەکران رایان دەکرد و رویان وەردەگێرا، خەلیفەکان ناچار دەبوون لە داواکردنیان پێ داگرن تا داوەری و فەرمانیان پێ بسپێرن، بەڵام ئەوانەی دینیان بە دونیا فرۆشت، جێگەی ئەو پێشەنگە پاکەیان گرتەوە، ئەوانەی لە ژێربوون شوێنی ئەوانەیان گرتەوە کە بەرز و خێربوون) ئیمام غەزالی لە بارەیانەوە دەڵێ: (خەڵکی ئەو سەردەمانە کاتێك عزەتی زانایانیان بینی، بینییان وا پێشەوا و فەرمانڕەوایان پێشوازیان لێدەکەن، ئەوان رویان لێ وەردەگێڕن. ملیان نایە فێربوونی زانست بە نیازی گەیشتن بە عیزەت و دەستکەوتنی پلە و پایە لای فەرمانڕەوایان، سەرقاڵی زانستی فەتوا بون و خۆیان بۆ فەرمانڕەوایان خستە روو، خۆیان پێ ناساندن و داوای والیەتی و بەستنی پەیوەندیان لێ کردن، هەندێکیان بێ بەش بوون و هەندێکیان پێی گەیشتن، پێی گەیشتوش لە پەستی داواکردن و سەرشۆڕی و بێ نرخی بێبەش نەبوو، دوای ئەوەی فەقیهەکان داواکراوبوون، بوون بە داواکار، بە روو وەرگێڕانیان لە دەسەڵاتداران خاوەن عزەت بوون، بە پێشوازی بۆ کردنیان زەبون بوون، تەنیا ئەو زانایانە نەبێ کە خودای بەرز لە هەمو سەردەمێك سەرکەوتووی کردن)[١٢٦].

ئیمام غەزالی (رەحمەتی خودای لێبێ) وێنەی واقعی زانایانی کێشاوە، پاش ئەوەی دونیا بۆتە ئامانجیان و دین بۆتە تاکە رێگەی گەیشتن بۆ بەر دەرگەی

---

١٢٦ احياء علوم الدين (١/٤١) وما بعدها الباب الرابع في سبب اقبال الخلق على علم الخلاف.

فەرمانڕەوایان، هەروەك ئومێدی وەدەست هێنانی خۆشەویستی دەسەڵاتداران هانی دەستەیەك لەوانەی دا كە بەرگی زانایان لەبەرە وەدوای زانست بكەون.

ئیمام مالیك دەڵێ: (ئەو زانستە تەنیا لە چوار كەس وەرناگیرێ، بێجگە لەوانە وەردەگیرێ: لە (سەفە) وەرناگیرێ، لە خاوەن ئارەزوویەك خەڵك بۆ بیدعەكەی بانگ بكا، لە درۆزن وەرناگیرێ كە بە درۆ قسەی خەڵك بگێڕێتەوە، ئەگەرچی لەسەر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ بە درۆزن دانەنرێ، لەو پیاوەش وەرناگیرێ كە خاوەن چاكەو كارسازو عیبادەتە بەڵام نازانێ فەرمودە لەبەركا و بیگێڕێتەوە)[127]. هەروەها دەڵێ: (ئەو زانستە دینە، بزانن دینەكەتان لە كێ وەردەگرن، بە حەفتا كەس گەیشتومە لەوانەی دەڵێن: پێغەمبەری خودا ﷺ لای ئەو كۆڵەكانە -ئاماژەی بۆ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ كرد- فەرمویەتی...) هیچم لێیان وەرنەگرتوە، ئەگەرچی، (بیت المال) بە هەركامیان سپێردرابا ئەمین دەردەچوو، بەڵام ئەوان ئەهلی گێڕانەوەی فەرمودە نەبون، كەچی ئیبن شەهاب هاتەلامان هەمومان لەبەر دەرگەی قەرەبەستەمان دەكرد)[128].

پیاوانێ ئەوە سیفەتیان بوو بێ ئیختیلافی گەورە لە نێویاندا روی نەداوە، ئەگەر روشیدابێ لە پێناو هەق دابووە، ئارەزووش ناتوانێ خۆبئاخنێتە نێو خیلافێ كە تەنیا هەقی تێدا مەبەست بێ... بۆ ئەوەی ئەو ئادابانە بكەینە بنچینە كە زانا بەرێزەكانمان پەیرەویان كردوە و بیانكەینە پێشەنگی چاكی خۆمان و پاكی دۆستایەتی ئەوان نمونەیەك بێ شوێنی هەڵبگرین. وا چەند نمونەیەك لە ئەدەبی ئیختیلافی گەورە ئیمامەكانی پێشین (سلف) ﷺ پێشكەش دەكەین.

---

١٢٧ الاتقاء (١٦).

١٢٨ سەرچاوەی پێشو.

## ئەبو حەنیفە و مالیک

لە کاتی خستنە رووی مەزهەبی ئیمامەکان باسی ئەو ئیختیلافە گەورەی نێوان ئەبی‌حەنیفە و مالیك مان کرد (رحمهم الله). ئەو بنەمایانەش رون بونەوە کە هەر یەکەیان تایبەت بە مەزهەبی خۆی پشتی پێ دەبەستێ. بەلاّم ئەو ئیختیلافە، سەرباری جیاوازی تەمەنی نێوانیان، نەبوە هۆی نەپەسنی یەکتر و نەنواندنی ئەندازەیەکی زۆری ئەدەب دەگەڵ یەکتری، هەرچەندە ئیختیلافیان لە بوچونی فیقهی‌دا هەبێ. قازی عیاض لە (المدارك) دا هیناویەتی، دەڵێ: لەیسی کوری سەعد دەڵێ: لە مەدینە توشی مالیك بوم پێم گوت: دەتبینم وا ئارەقەی نێوچەوانت دەسڕیتەوە؟ گوتی: لای ئەبو حەنیفە بووم ئارەقەی پێ کردم، بەراستی ئەی مصری (لەیس مصری بوو) ئەبو حەنیفە فەقیهە. لەیس دەڵێ: پاشان توشی ئەبو حەنیفە بوم، پێم گوت: ئەو پیاوە (ئاماژە بۆ مالیك دەکا) بە چاکی باسی کردی. ئەبو حەنیفە گوتی: کەسم نەدیوە وەك ئەو وەلاّمی راست و خێرا و رەخنەی تەواو بێ.[١٢٩]

## موحەممەدی کوری حەسەن و مالیک

موحەممەدی کوری حەسەن بە دیارترین هاوڕێی ئەبو حەنیفە دادەنرێ و نوسەرەوەی مەزهەبەکەیەتی، چووە لای مالیك و سێ ساڵ لای مایەوە، (الموطأ)ی لێیەوە بیست، رۆژێك ئیمام موحەممەد کوری حەسەن و ئیمام شافیعی دەوریان دەکردەوە، موحەممەد دەڵێ: هاوڕێی ئێمە (ئەبو حەنیفە) زاناترە لە هاوڕێی ئێوە (مالیك)، هاوڕێی ئێمە هەق نی‌یە بێدەنگ بێ و هی ئێوە بدوێ - وەك بیەوێ بەو قسەیە ئیمام شافیعی بوروژێنێ - ئیمام شافیعی دەڵێ: توبی خودا کامەیان لە

---

١٢٩ سەرچاوەی پێشو.

سوننەتی پێغەمبەر ﷺ زاناترن، مالیك یان ئەبو حەنیفە؟ موحەممەد دەڵێ: مالیك، بەڵام هاوڕێی ئێمە قیاسی چاکتر بو، شافیعی دەڵێ: گوتت: بەڵێ وە لە قورئانیش مالیك لە ئەبو حەنیفە زاناتربوو، جا هەر کەسێ لە قورئان و سوننەت زاناتربێ ئەو بو ئاخاوتن لە پێشترە، ئیمام موحەممەد بێدەنگ دەبێ.[130]

## شافیعی و موحەممەدی کوڕی حەسەن

ئیمام شافیعی دەڵێ: ڕۆژێك موحەممەدی کوڕی حەسەنم دواند، قسە و ناکۆکی کەوتە نێوانمان، تا ئەوەی سەرنجم دا دەماری ملی هەڵدەستا و دوگمەی دەپچڕا.[131]

موحەممەدی کوڕی حەسەن دەڵێ: کەس نەبوو لە شافیعی زیاتر موخالیفمان بێ و پێمان بسەلمێنێ. پێیان گوت: بوچی؟ گوتی لەبەر ڕەوانی و خوگری لە پرسیار و وەلام و گوێ گرتنیدا...[132].

ئەوە چەند نمونەیەك بوو لە ئەدەبی ئیختیلافی زانایانی ئوممەت، دەتوانین ئەوەی لێ هەڵبێنجین کە: پاشینە (خلف)ی ئوممەت لەسەدە چاکەکان شوێن پێی پێشینەکانیان دەگرتەبەر، هەموویان لە کانی ئەدەبی پێغەمبەرایەتییەوە پاراو دەبوون، ئەدەبی پێشینە چاکەکان تەنیا دورکەوتنەوە لە بریندار کردن و ناشیرین کردن نەبوو، بەڵکو لە ئادابە باوەکانی ئەو کۆمەڵە زانایە، چەسپاوبوون لە وەرگرتنی زانست و خو دوورگر بوون لە مل دانە بەر ئەو شتەی زانستیان لێی نەبووە. لە ترسی تووش بوونی هەڵە، خۆیان لە فەتوا لادەدا. خاوەنی (القوت) دەڵێ: عەبدورەحمان کوڕی ئەبی لەیلا ڕیوایەت دەکا دەڵێ: لەو مزگەوتە (مزگەوتی

---

١٣٠ سەرچاوەی پێشو.

١٣١ سەرچاوەی پێشو.

١٣٢ الاتقاء (٣٨).

پێغەمبەر ﷺ) توشی سەد و بیست هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ هاتم. یەکێکیان نەبوو پرسیاری لە بارەی فەرمودەیێ یان فەتوایێ لێ بکرێ تەنیا ویستویەتی براکەی لەو بارەوە وەڵام بداتەوە. لە وتەیەکی‌تردا: پرسیارێك لە یەکیان دەکرا، بەرێی دەکرد بۆ ئەوی‌تر، ئەوی‌تر بۆ ئەوی‌تر... تاکو دەگەڕایەوە لای ئەوەی یەکەم جار پرسیاری لێکراوە...[۱۳۲].

ئەو پیاوانە بەرزتر بوون لەوەی هەست بە کەماتی بکەن. هەریەکێکیان لەترسی گوناه لە بەردەم مەسەلەیەکدا رادەوەستا. بۆ نموونە: پیاوێك لە مەر مەسەلەیەك پرسیاری لە مالیکی کوڕی ئەنەس کرد، گوتی قەومەکەی لە دوری شەش مانگەرێ ناردویانە تا پرسیاری ئەو مەسەلەیە بکا. مالیك دەڵێ: بەو کەسە بڵێ تۆی ناردوە، من هیچ زانستم لەو مەسەلەیە نیە. پیاوەکە دەڵێ: ئەی کێ دەزانێ؟ مالیك دەڵێ: ئەوەی خودا فێری کردوە. مەلائیکە گوتیان: ﴿لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا﴾ البقرة: ۳۲

دیسان لە مالیکەوە ریوایەت کراوە کە چل و هەشت پرسیاریان لێ کردوە، بۆ سی و دوویان گوتویە: نازانم.

خالیدی کوڕی خەدداش دەڵێ: بە چل پرسیارەوە روم کردە ئێراق بۆ لای مالیك و لێم پرسی، وەڵامی هیچی نەدامەوە تەنیا پێنج پرسیار نەبێ.

ئیبن عەجلان دەڵێ: ئەگەر زانا وازی لە وشەی (نازانم) هێنا، ئەوە شوێنی کوشندەی پێکراوە (خۆی کوشتوە).

مالیك لە عەبدوڵلای کوڕی یەزید کوڕی هورمز ریوایەت دەکا دەڵێ: دەبێ زانا وشەی (نازانم) بۆ هاونشینانی بکاتە میرات، تا ئەومیان وەك بنەڕەتێك بە دەستەوە بێ پەنای بۆ بەرن. گەر کەسێ پرسیاری کرد لەوەی نایزانێ بڵێ (نازانم).

---

۱۳۲ اتحاف السادة المتقين (۱/۲۷۹-۲۸۰).

ئەبو عمری كوڕی عبدالبر* دەڵێ: لە (ئەبی الدرداء)ەوە هاتوە گوتویە: نازانم نیوەی زانستە.

## مالیك و ئیبن عویەینە

ئیبن عویەینە[124] نزیك و هاوویَنەی مالیك بوو، ئیمام شافیعی دەڵێ: (مالیك و ئیبن عویەینە هاوویَنەن، ئەگەر مالیك و ئیبن عویەینە نەبان زانستی حیجاز نەدەما)[125] دەگەڵ ئەوەش دا دەگێڕنەوە: جارێك ئیبن عویەینە باسی فەرمودەیەكی كرد، پێی گوترا: مالیك لەو فەرمودەدا موخالیفی تۆیە. بە قسەكەرەكەی گوت: بە مالیك بەراوردم دەكەی؟ من و مالیك وەك ئەوەین كە جریر دەڵێ:

وابن اللبون اذا مالزّ في قرن　　لم يستطع صولة البزل القناعيس

گۆلكی شیرە خۆرە ئەگەر قۆچیشی ڕەق بێ　　ناتوانێ شالاّوی كەڵە قۆچانی هەبێ

ئەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لە سوفیانی كوڕی عویەینە دەگێڕنەوە:

(یو شك ان يضرب الناس اكباد الابل في طلب العلم فلايوجد عالم اعلم من عالم المدينة)

(نزیكە خەڵك بە دوای زانست دا وێڵ بێ جا زانایەك نابێ لە زانای مەدینە زاناتر) بە سوفیان دەڵێن: ئەوە كێیە؟ دەڵێ: ئەوە مالیكی كوڕی ئەنەسە. ئەوجا دەڵێ: هەر فەرمودەیەك سەحیح نەبوایە ڕاینەدەگەیاند. فەرمودەی لە خەڵكی متمانە

---

* لە ساڵی (٤٦٣) ك وەفاتی كردوە.

124 سفيان بن ابي عينة بن ابى عمران ميمون الهلالي المكي بابي محمد. ئیمامێكی كوفیيە. فەقیهـ و فەرمودە ناسە، لە كوفە لە دایك بووە، لە مەككەی پیرۆز لە ساڵی (١٩٨) ك وەفاتی كردوە سەرگوزەشتەی لە: تاريخ بغداد (١٧٤/٩) و الحلية (٢٧٠/٧) و طبقات ابن سعد (٤٩٧/٥) والجرح والتعديل (٢ق١/٥٥) وتهذيب التهذيب (١١٧/٤) دا هەیە.

125 الانتقاء (٢٢).

پێکراو نەبوایە وەرنەدەگرت، دوای مردنی مالیکی کوڕی ئەنەس مەدینە بە ویرانی دەبینم.[136]

## مالیک و شافیعی

ئیمام شافیعی فەرموویە: مالیکی کوڕی ئەنەس مامۆستامە و زانستم لەو وەرگرتوە، ئەگەر باسی زانایان کرا مالیك ئەستێرەیانە، کەس وەك مالیك چاکەی بەسەرمەوە نی‌یە ...[137] فەرموویە: ئەگەر لە مالیکەوە فەرمودەت بۆ هات. دەستەکانتی توند لێ گیرکە، ئەگەر مالیکی کوڕی ئەنەس گومانی لە فەرمودەیەك هەبێ هەمووی وەلادەنێ.

## ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و مالیک

لە ابی زرعە الدمشقی‌یەوە دەڵێ: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو لە بارەی سوفیان و مالیك لێیان پرسی ئەگەر ئیختیلافیان لە ریوایەتێکدا هەبێ؟ فەرمووی: مالیك لە دڵم دا گەورەترە. دەڵێ گوتم: ئەی مالیك و ئەوزاعی ئەگەر ئیختیلافیان هەبێ؟ فەرمووی مالیك لام خۆشەویستترە. هەرچەندە ئەوزاعی یەك لە ئیمامەکانە. پێیان گوت: ئەی ئیبراهیم (النخعی) دیاریبوو کە لای وابوو نابێ ئیبراهیم دەگەڵ مالیك بەراورد بکرێ چونکە ئەو لە ئەهلی فەرمودە نەبوو، بۆیە فەرمووی: ئەویان دەگەڵ هاوچەرخانی خۆی دابنێ. پرسیاری لێکرا پیاوێك دەیەوێ فەرمودەی پیاوێکی -دیاری کراو- لەبەر بکات، فەرمودەی کێ بەچاك دەزانی بۆی؟ فەرمووی: با فەرمودەی مالیك لەبەر بکات.[138]

---

١٣٦ سەرچاوەی پێشو (٣٦).

١٣٧ سەرچاوەی پێشو (٢٣).

١٣٨ سەرچاوەی پێشوو (٣٠).

## رای هەندێک زانایان لە بارەی ئەبو حەنیفە

شوعبەی کوڕی الحجاج[139] لە فەرموودەدا میری باوڕداران بووە، ئەبو حەنیفەش لە ئەهلی رەئی لەو پلەیە بوە کە زانیمان. سەربارەی جیایی مەنهەجیان، شوعبە زۆر ڕێزی بۆ ئەبو حەنیفە هەبووە. خۆشەویستی و نامەگۆڕینەومیان لە نێواندا بووە، شوعبە متمانەی بە ئەبو حەنیفە هەبووە. داوای لێدەکا شتی بۆ باس بکا، کاتێ هەواڵی مردنی پێ دەگا دەڵێ: فیقهی کوفە دەگەڵ ئەو رۆیشت، سڵاو و رەحمەتی خودا لەسەر ئەو و ئێمە بێ.[140]

پیاوێ پرسیاری ئەبو حەنیفەی لە یەحیای کوڕی سەعید القطان کرد، گوتی: هیچ کەس لای خودا جوان نابێ بە غەیری ئەوەی خۆی فێری کردوە، وەڵاهی ئێمە هەرشتێکمان لە گوتاری ئەو پێ چاك بوایە پێمان وەردەگرت.

بەم شێوەیە ئیختیلاف و جیایی بیروڕا بۆ کەس نەدەبوە بەرگر لە وەرگرتنی ئەوەی پێی چاکە لای هاوڕێکەی و باسکردنی لەو شتە داو گوتەی خۆی بداتە پاڵی.

زۆر ریوایەت لە عەبدوڵلای کوڕی موبارەك هاتوە ستایشی ئەبو حەنیفە دەکا: بە خێر و بە چاکی باسی دەکرد، بە پاکی دادەنا و گوتەکانی وەردەگرت و پەسنی دەدا. رێگەی کەسی نەدەدا لە مزگەوتەکەی دا بە خراپی باسی بکا، رۆژێك هاونشینێکی دەیەوێ تەشەر لە ئەبو حەنیفە بدا، پێی دەڵێ: بێدەنگ بە، وەڵاهی ئەگەر ئەبو حەنیفەت دیبا، عەقڵ و جوامێریت دەدی.

---

١٣٩ شعبە بن الحجاج بن الورد ابو بسطام: لە قەبی میری باوڕدارانە لە فەرموودە دا لەساڵی (١٦٠) ك وەفاتی کردوە. سەرگوزەشتەی لە: تاريخ بغداد (٩/٢٥٥ و دوای ئەو) و تهذيب التهذيب (٤/٣٣٨) و دوای ئەو والتذكرة (١٩٣ و دوای ئەو) والتاريخ الكبير للبخاري (٢ق٢/٢٤٤) والتاريخ الصغير لە (٢/١٣٥) وطبقات ابن سعد (٧/٢٨٠) دا هەیە.

١٤٠ الانتقاء (١٢٦).

لـه شـافیعی‌یەوە دەگێڕنـەوە فەرمویـە: ڕۆژێ لـە بـارەی (عوسمـان البـتی) پرسیاریان لە مالیك كرد، فەرمووی: پیاوێكی مام ناوەندی بوو، پرسیاری (ابن ابی شبرمە)یان لێكرد، فەرمووی پیاوێكی مام ناوەندی بوو، گوتیان ئەی ئەبو حەنیفە؟ فەرمووی: ئەگەر هاتە لای كۆڵەكەكانی ئەو مزگەوتە و قیاسی بۆ كردن كە ئەوە تەختەدارە، وا گومان دەبەن تەختەبێ[141] ئاماژەیە بۆ شارەزایی لە قیاسدا. زۆر جار لە ئیمام شافیعی ریوایەت كراوە فەرموویە:... خەڵكی لە فیقهدا بەردەستی (ئەبو حەنیفە)ن.[142]

كوڕی ئەو پیاوانـە هیچـی تێـدا بـاس نـەدەكرا تـەنیا خـێر نـەبێ، هـەر كـەس ویستبێتی ئەو ئادابانە ببەزێنێ كە پێویست بوو دەگەڵ پێشەوایانی ئوممەت رەچاو بكرێ، دەهێنرایەوە سەر ڕێ و بواریان نەدەدا بە خەراپە باسی كەس بكا. پرسیار لە فەزلی كوڕی موسای سینانی[143] كرا: چ دەڵێی لەمەڕ كەسانێ قسە بە ئەبو حەنیفە دەڵێن؟ گوتی: ئەبو حەنیفە زانستی زانراو و نەزانراوی بۆ هێنان، هیچی بۆ بەجێ نەهێشتن جا حەسودیان پێ برد.[144]

ئەوە هەندێك گوتەی پێشەواكانی فەرمودە بوو نەقڵ كرا كە موخالیفی زۆربەی بۆچوونەكانی ئیمام ئەبو حەنیفە بوون، بەڵام ئیختیلافیان دەگەڵی نەبوتە هۆی ئەوەی پەسنی نەدەن و ستایشی نەكەن و یادكردنی لەو چاكەی ئەو خاوەنی بووە.

---

١٤١ سەرچاوەی پێشو (١٤٧).

١٤٢ سەرچاوەی پێشو (١٣٦).

١٤٣ یەك لە زانا باوڕ پێكراوەكانە، خەڵكی (سینان)ە، گوندێكە لە خوراسان، لە تابعی‌یە بچووكەكان ریوایەتی كردووە. لە ساڵی (١٩١ یان ١٩٢) وەفاتی كردوە. سەرگوزەشتەی لە: المیزان (٣/٣٦٠) سەرگوزەشتەی (٦٧٥٤) والتقریب (٢/١١١) چاپی المكتبە العلمیە لە مەدینەی منەوەرە وتهذیب التهذیب (٨/٢٨٦) هەیە.

١٤٤ سەرچاوەی پێشوو.

ئەوەش لەبەر دڵنیاییان کە خیلافی نێوانیان زادەی هەوای نەفس و ئارەزوی خۆ بەزل گرتن نییە. بەڵکو دۆزینەوەی هەق ئامانجی هەموویان بووە (رەحمەتی خودایان لێبێ) ئەگەر ئەو ئاکارە بەرێز و ئادابە بەرزە نەبوایە، فیقهێکی زۆری زانایانی پێشینەی چاك لەدەست دەچوو. ئەوان داکۆکیان لە هیچ کەس نەدەکرد ئەگەر لەبەر زانستەکەی نەبوایە. لەوەشدا پاراستنی فیقهی ئەو ئوممەتەیە کە لە سێبەری ئەم دا نەبێ ژیانی راست نابێتەوە.

## رای هەندێك زانایان دەربارەی شافیعی

ئیبن عویەینە - هەر خۆی شایانی شوێنی خۆیەتی - ئەگەر شتێکی لەسەر تەفسیر و فەتوا بۆ دەهات روی بۆ لای شافیعی وەردەگێراو دەیگوت: لەوە بپرسن. زۆر جار کە دەیبینی دەیگوت: ئەوە چاکترین لاوی رۆژگاری خۆیەتی. کاتێ هەواڵی وەفاتی شافیعی پێ گەیشت، گوتی: ئەگەر موحەممەدی کوری ئیدریس مردبێ ئەوا چاکترین کەسی رۆژگارەکەی مردوە.

یەحیای کوری سەعید القطان دەڵێ: من لە نوێژیشدا دوعا بۆ شافیعی دەکەم. عەبدوڵلای کوری عەبدولحەکەم و کورەکەی لەسەر رای ئیمام مالیك بوون بەلام ئەوە نەبووە بەرگر لەوەی کە عەبدوڵلا وەسیەتی موحەممەدی کوری بکا بۆ هاورێیەتی شافیعی و پێی بڵێ: هاورێیەتی ئەو شێخە (واتە شافیعی) بکە، کەسم نەدیوە وەك ئەو شارەزای ئوصولی زانست یان ئوصولی فیقهـ بێ. پێدەچێ کور ئامۆژگاری باوکی وەرگرتبێ، چونکە دەڵێ: ئەگەر شافیعی نەبوایە نەمدەزانی وەڵامی کەس بدەمەوە. ئەوەی دەیزانم لەوی فێر بووم، ئەوبوو قیاسی فێرکردم رەحمەتی خودای

لێبێ بە راستی خاوەنی سوننەت و ئەسەر و چاکە و خێر و زەمانێکی رەوان و عەقڵێکی راستی پتەو بوو.[145]

## نێوان ئیمام ئەحمەد و ئیمام شافیعی

عەبدوڵڵای کوری ئیمام ئەحمەد دەڵێ: بە باوکم گوت: شافیعی چۆن پیاوێك بووە، گوێم لێتە زۆری دوعا بۆ دەکەی؟ گوتی: ئەی کوری خۆم: شافیعی رەحمەتی خودای لێبی بۆ دونیا وەکو خۆر بوو، بۆ خەڵکی خۆشی و خێر بوو، سەیرکە ئایا جێگر و بەدیلێك بۆ ئەو دوانە هەیە؟ صالحی کوری ئیمام ئەحمەد دەڵێ: یەحیای کوری موعین توشم هات و گوتی: ئەوە باوکت شەرم ناکا لەوەی دەیکا؟ گوتم: چ دەکا؟ گوتی: دەگەڵ شافیعی بینیم، شافیعی بە سواری و ئەویش پیادە جڵەوی ئەسپەکەی گرتبوو، ئەوەم بە باوکم گوت، گوتی: ئەگەر توشی هاتیەوە پێی بڵێ: باوکم پێت دەڵێ: ئەگەر دەتەوێ شارەزای فیقهـ بیت وەرە تەنیشتەکەیتری (شافیعی) و رکێفەکەی بگرە.[146]

باوکی حەمیدی کوری ئەحمەدی البصری دەڵێ: لای ئەحمەدی کوری حەنبەل بووم و مەسەلەیەکمان باس دەکرد، پیاوێك بە ئەحمەدی گوت: ئەی باوکی عەبدوڵڵا ئەم مەسەلەیە فەرمودەی سەحیحی لەسەر نییە. گوتی: ئەگەر فەرمودەی سەحیحی لەسەر نەبێ ئەوا شافیعی تێیدا وای گوتوە، بەڵگەی ئەویش تێیدا سەلمێنەرترین شتە (پاشان ئیمام ئەحمەد گوتی) بە شافیعیم گوت: لە مەر مەسەلەیەکی ئاوا و ئاوا... چ دەڵێی؟ وەڵامی دایەوە. گوتم: ئەو گوتەیەت لە کوێ هێنا؟ ئایا قورئان

---

١٤٥ سەرچاوەی پێشوو (٧٣).

١٤٦ سەرچاوەی پێشوو.

یان فەرمودەی لەسەر هەیە؟ گوتی: بەڵێ. لەو بارەوە فەرمودەیەکی پێغەمبەری ﷺ دەرهێنا، وەلامەکەی دەقی فەرمودەکە بوو.[147]

ئەحمەد رەحمەتی خودای لێبێ دەڵێ: ئەگەر مەسەلەیەکیان لێ پرسیبام هیچ بەڵگەم لەسەری نەبوایە، دەمگوت: شافیعی وا دەڵێ. چونکە پێشەوایەکی زانای قورەیشی‌یە.[148]

داودی کوری عەلی الاصبهانی دەڵێ: بیستم ئیسحاقی کوری راهەوەی دەڵێ: ئەحمەدی کوری حەنبەل لە مەککە توشم بوو گوتی: وەرە تا پیاوێکت نیشاندەم چاوت وێنەی ئەوی نەبینیوە... شافیعی نیشاندام.

ئەوە رای ئەحمەدی کوری حەنبەل بوو بەرامبەر شافیعی رەحمەتی خودایان لێبێ سەیریش نی‌یە قوتابی بە مامۆستاکەی سەرسام بێ و دان بە چاکەی دابنێ. بەلام شافیعی خۆی -خوێندنی ئەحمەد لە لای- رێی لێ نەگرت کەدان بنێ بە چاکە و زانستی لە سوننەدا، پێی دەڵێ: ئێوە لە فەرمودە و ناسینی پیاوانی دا لەمن شارەزاترن. ئەگەر فەرمودە سەحیح بوو پێم بڵێن، چ کوفی یان بصری یان شامی بێ ئەگەر سەحیح بێ وەری دەگرم.[149]

کاتی شافیعی باسی ئەحمەدی دەکرد (لە بەر رێزگرتنی) ناوی نەدەهێنا، بەڵکو دەیگوت: (متمانە پێکراو -الثقة- لە هاوەڵانەوە بۆی باسکردین، یان متمانە پێکراو هەواڵی پێداین، یان متمانە پێکراو ئاگاداری کردین)[150]

ئەوە روانینێکی بەڵەز بوو[151] بۆمان رون دەکاتەوە کە ئەوەی پێشینانمان لەسەری بوونە لە ئەدەبی شایان و رەوشتی بەرز کە ئیختیلاف دەروەستی نایە و

147 آداب الشافعي ومناقبه (٨٦-٨٧).

148 هامش: آداب الشافعي ومناقبه (٨٦).

149 الانتقاء (٧٥).

150 مناقب الامام احمد لابن الجوزي (١١٦).

جیاوازی ئیجتهادی کاریان تێ ناکا. ئەوە ئادابی ئەو پیاوانەیە لە قوتابخانەی موحەممەدی دەرچونە، هەوا و ئارەزو دەسەڵاتی بەسەریان دا نەبوە، کتێبەکانی سەرگوزەشتە و طبقات و شوێنەواری گەورە پیاوان و مێژوو، پڕن لە هەڵوێستی لە ژمارە نەهاتوی جوامێرانەو مونازەراتی نایاب لە نێوان گەورە پێشەواکان کە ئەدەب دایگرتوون و رەوشتی ئیسلامی بەرز جۆشی داون. ئەگەر ئێمە بەهەقیقەت هەوڵی هێنانەوەی ژیانێکی چاکی ئیسلامی دەدەین هەق وایە کە هەموو کاروبارێکی ژیانمان پەرت و بڵاوە، بگەڕێینەوە سێبەری ئەو سەیوانە پیرۆزەو لەسەر ئەو ئادابە بەرێزە یەکبگرین کە پێشینە چاکەکان بۆیان جێهێشتوین، نکوڵی لەوە ناکەین کە چەند هەڵوێستێك هەبووە تێیدا رەچاوی ئەدەبی ئیختیلاف نەکراوە یان خاڵی بووە لەو نیشانە چاکانەی باسمان کرد. بەڵام ئەوە هەڵوێستی لاساکارانە یان دواکەوتوانە بووە کە بە ناوی دەمارگیری ناو دێران و لەسەر لاساکردنەوە رشت بوون. هەستیان بە هەقیقەتی گیانی زانستی بەرز نەکردووە کە لەپشت هۆکانی ئیختیلافی زانایانەوە حەشاردراوە. ئیلهامیان لەو ئادابە بەرزانە وەرنەگرتووە کە زادەی نیەتی راستەقینەن لەگەران بەدوای هەقداو پێکانی ئامانجێ کە یاسادانەری لێزان مەبەستییەتی.

دەبێ ئەوانە لەو کەسانە بن کە ئیمام غەزالی لەبارەیانەوە دەڵێ:

دوای ئەوەی فەقیهەکان داواکراو بوون، بوون بە داواکار، بە ڕوو وەرگێڕانیان لە دەسەڵاتداران خاوەن عزەت بوون، بە پێشوازی لێکردنیان زەبوون بوون.

داواکراو گەورەی خۆیەتی، لەسەر هەق نەبێ وەدەنگ نایە، کەچی داواکار خۆی فرۆشتوە، هەق ناڵێ مەگەر بۆ دڵی نان بدەی نەبێ. ئەو ئیختیلافەی نیعمەت بوو، فیقهی ئیسلامی دەوڵەمەند کردبوو، واقعیەتی ئەو دینەو رەچاوکردنی بەرژەوەندی

---

١٥١ بەڵکو خودای بەرز ئەجەل دوابخا، نیعمەتی دەست بەتاڵیمان پێبدا، تا ئەوەی پێمان کودەکرێتەوە لە کەلەپوری زانایانی ئیسلام لەو بوارەدا کۆی بکەینەوە.

خەڵكی چەسپاندبوو، بۆ ئازارێكی سەخت گۆڕدرا و بووە هۆیەك لە ترسناكترین هۆیەكانی پەرتەوازەیی و بەگژیەكداچوونی موسوڵمانان. بەڵكو گۆڕا بۆ بەدبەختی و پەرتكردن و بەفیڕۆدانی توانای ئوممەت و نەمانی سوودی و سەرقاڵی كرد بە شتێك كە نەدەبوو پێی سەرقاڵ بێ.

ئەو ئیختیلافەی هەندێك لایەنیمان لەپێشەوە خستە روو، ئاماژەمان بۆ ئەو ئادابە بەرزەی كرد كە پیاوانی لەسەر بوون، ئەو ئیختیلافەیە كە نووسەرەكان لە كۆن و نوێدا كتێبیان لەسەر -هۆیەكانی ئیختیلافی فەقیهەكان- داناوە. بەڵام ئەو خیلافەی دوای ئەو سەدە چاكانە دێ ئەوە جۆرێكی ترە، هەروەك هۆكەلی جیاتریشی هەیە.

له سەدەی چوارەمی کۆچی‌یەوە ئیجتهاد نەماو خۆری ئاوابوو. لاسایی برەوی سەند، کتێب و نوسین داهێنران، کاوێژی گوتەی خەڵکان و فەتوا بە مەزهەبی تاکە موجتەهیدێك و وەرگرتنی گوتەی و گێڕانەوە لێی و خۆفێرکردنی مەزهەبەکەی و شتی لەو بابەتە لە سەدەکانی یەکەم و دووەمدا نەبوون.[152] لە سەدەی سێیەمیشدا ئیجتهاد بەردەوام برەوی هەبوو. لەوانەیە هەندێك زانا ویستبیان لە سەربناغە و ئوصولی ئەهلی زانستی پێش خۆیان شت دەربێنن بەڵام بێ لاساکردنەوە و پەنا بردن بۆ گوتەکانیان.

کەچی خەڵکی سەدەی چوارەم، زانا و عەوامی تێدابوو. خەڵکی عەوام ئەو مەسەلانەیان لە ئەهلی زانست وەردەگرت کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کراوە و لای کۆمەڵی موجتەهیدان خیلافی لە سەر نییە، وەك: پاکژیی و نوێژ و رۆژ و زەکات و شتیتر ، بەو شێوەیەی کە بۆیان ریوایەت دەکرا رەفتاریان پێ دەکرد.

ئەگەر کارێکی ئاڵۆزیان توش هاتبا و پێویستیان بە پرسین بوایە، لەو بارەوە پرسیان بە ئەهلی زانست دەکرد، بێ‌ئەوەی ئەو مەزهەبە لەبەر چاو بگرن کە زانایەکە لەسەری بوو.

بەڵام خەڵکی تایبەت و ئەهلی زانست، سەرقاڵی فەرموودە بوون، لە فەرموودەکانی پێغەمبەرو ﷺ ئەسەری هاوەڵانی و ئەوانە و شتیتریش کە پێویستیان پێ‌بوایە لەمەسەلەیەکدا وەك فەرموودەیەکی (زیادە ناسراو)و گوتەیەکی (زیدە دیار)ی کۆمەڵی هاوەڵان و تابعی‌یەکان. ئەگەر یەکێکیان لەمەسەلەیەکدا ئەوەی دەست نەکەوتبا کە پێی دڵنیا بێ، لەبەر تێکگیربوونی نەقلێك و روون نەبوونی چاکترێتی و شتی لەو بابەتە ئەوا بۆ گوتەی زانایانی پێش خۆی دەگەڕایەوە. ئەگەر

---

152 قوت القلوب لابي طالب المكي عن حجة الله البالغة (٣٢١).

دوو گوتەی دۆزیبایەوە کامەی متمانە پێکراوتر بوایە هی خەڵکی مەدینە یان کوفە ئەوی هەڵدەبژارد.

ئەهلی تەخریجیش، ئەگەر دەقێکی راشکاویان لە بابەت مەسەلەیەك دەستنەکەوتبا ئیجتهادیان لە مەزهەبەکان دەکرد، لەبەرئەوە دەدرانە پاڵ ئەو مەزهەبەی فەرمودەیان لەسەر دەهێنا، جا دەگوترا: فلان شافیعی و فلان حەنەفی‌یە، بێ ئەوەی پابەندی بە مەزهەبەکەوە بکرێ وەك چۆن دوایی حاڵ بەوە گەیشتە فەرمودە ناسەکانیش دەدرانە پاڵ ئەو مەزهەبەی کە لەزۆر شت دەگەڵی هاورا بوون. بۆ نمونە: نەسائی و بەیهەقی و خطابی دراونەتە پاڵ مەزهەبی شافیعی، هەرکەس موجتەهید نەبوایە نەدەبووە قازی، زاناش ئەگەر موجتەهید نەبوایە بە فەقیه ناو نەدەبرا.

## بارودۆخی دوای سەدەی چوارەم

دوای سەدەی چوارەم بارودۆخ گۆرا، با بوار بە ئیمام غەزالی• بدەین باسی ئەوەمان بۆ بکا، کە دەفەرموێ: (بزانە خەلافەت دوای پێغەمبەر ﷺ خەلیفەکانی راشدین گرتیانە دەست، ئەوان ئیمامی زانای خوداناس بوون. فەقیهی حوکمەکانی بوون، لەکێشەکان دا سەرگەرمی فەتوادان بوون، بەدەگمەن نەبا پشتیان بە زانایان نەدەبەست ئەویش لەو روداوانەی پێویستیان بە راوێژ دەبوو، زاناکان سەرقاڵی زانستی بەرێ بوون و لێبرابوون بۆی. فەتوا و ئەوەی پەیوەندی بەحوکمی خەڵقی دونیا هەبوو وەلایان نابوو، بەهەموو ئیجتهادیانەوە بەرەو بارگای خودا رۆیشتن وەك لە سەرگوزەشتەیان نەقڵ کراوە. کە خەلافەت دوای خەلیفەکان کەوتە بەر دەستی قەومێکی ناموستەحەق و نەزان بەزانستی فەتوا و حوکمەکان، ناچار بوون پەنا بۆ زانایان ببەن و لە هەموو بارێکیان دا هاورێیەتیان بکەن و لە رەوتی حوکم

• لە (٥٠٥ ك) وەفاتی کردووە.

کردندا پرسیان پێ بکەنە لە زانایانی تابعی ئیوا مابوون کە بەردەوام لەسەر شێوازی یەکەمین پێشەنگ بوون و پەیوەست بوون بە پاکێتی دین و پاراستنی ڕێبازی زانایانی سەلەف. ئەوان ئەگەر داوا دەکران رایان دەکرد و روویان وەردەگێڕا. خەلیفەکان ناچاردەبوون لە داواکردنیان پێ داگرن تا دادوەری و فەرمانڕەواییان پێبسپێرن، خەڵکی ئەو سەردەمانە کاتێك عززەتی زانایانیان بینی و بینییان وا پێشەوا و فەرمانڕەوایان پێشوازیان لێدەکەن، ئەوان روویان وەردەگێڕن. ملیان نایە فێربونی زانست بە نیازی گەیشتن بە عززەت و دەست کەوتنی پلە و پایە لای فەرمانڕەوایان. سەرقاڵی زانستی فەتوا بوون و خۆیان بۆ دەسەلأتداران خستە روو، خۆیان پێ ناساندن و داوای والیەتی و بەستنی پەیوندیان لێکردن، هەندێکیان بێ بەش بوون و هەندێکیان پێی گەیشتن، پێی گەیشتوش لە پەستی داوا کردن و سەرشۆری بێ نرخی بێ بەش نەبوە، دوای ئەوەی فەقیهەکان داواکراوبوون، بوون بە داواکار، بە روو وەرگێڕانیان لەدەسەلأتداران خاوەن عززەت بوون، بە پێشوازی بۆ کردنیان پەست و زەبوون بوون، تەنیا ئەو زانایانە نەبێ کەخودای بەرز لە هەموو سەردەمێك سەرکەوتووی کردن. لەو سەردەمانەدا زانستی فەتوا و حوکم دان برەوی زۆر بوو لەبەر پێویستی خەڵك بۆیان لە ولایەتەکان و حوکمەتەکاندا.

پاشان کاربەدەست و فەرمانڕەوایان پەیدا بوون گوێ بیستی وتارگەلێ دەربارەی بنەماکانی بیروباوڕ و دەمەقاڵەی کەلامی دەبوون، خەڵك روویان کردە زانستی کەلام[152] نوسراویان تێیدا پەرە پێداو ڕێگەکانی دەبەدەمەیان داهێنا و هونەری دژ بە دژەیان لە وتارگەلان دەرهێنا، واش گومانیان دەبرد کە ئامانجیان داکۆکی کردن لە دینی خودا و پاراستنی سوننەت و بنبڕکردنی بیدعەیە. هەروەك

١٥٢ زانستی ئاخاوتن (دوان): زانستی عەقیدە و یەکتاپەرستییە. لەبەر بابەتگەلی دەمەقاڵێ بە زانستی (کەلام) ناونراوە. لێکۆلەران لەکاتی ئاخاوتن لە مەسەلەی عەقیدەدا پشت بە هێنانی شوبهە و گومانی موخالیفان و رەتدانەوەیان دەبەستن.

ئەوانی پێشتر پێیان وابوو ئامانجیان لەسەرقاڵی بە فەتوا: دین و سەرپەرشتی حوکمی موسوڵمانانە لەبەر سۆز و بەزەییان بۆ خەڵقانی خودا و ئامۆژگاری بۆیان، پاشان هەندێك پەیدابوون خودانە بەر کەلامیان بەراست نەدەزانی و دەرگەی مونازەرەیان بەسەردا کردەوە، لەوەش دا دەمارگیری ناهەموار و دژایەتی (فاشیانە) سەری هەڵدا کە سەری کێشا بۆ خوێن رێژی و وێران بوونی وڵات، نەفسی کێشایە نێو مونازەرەی فیقهی و روونکردنەوەی چاکترین مەزەب بە تایبەتی لە شافیعی و حەنەفی ﷺ جا خەڵکان وازیان لە کەلام و هونەری زانست هێنا و رژانە سەر مەسەلەی خیلافی نێوان ئیمام شافیعی و ئەبو حەنیفە، بەڵام بەئاسانی بەسەر خیلافی نێوان مالیك و سوفیان[154] و ئەحمەد تێپەرین رەحمەتی خوایان لێبێ.

گومانیان وابوو کەتەنیا مەبەستیان هەڵگۆزانی وردەکاری شەرعی و دەرخستنی هۆیەکانی مەزەب و رێ خۆش کردنی ئوصولی فەتوایە، جا هەڵێنجانیان تێدا پتر کرد، جۆرەها دەمبەدەمە و دانراویان لەسەر سازاند، کە تاکو ئێستاش لەسەری بەردەوامن. نازانین لەچەرخەکانی دوای ئێمە خودا چیتر وەدی دێنێ. تەنیا ئەوەش هۆی رووکردنە خیلاف و مونازەرات بووە. ئەگەر نەفسی دەسەڵاتدارانی دونیایی مەیلی خیلافیان دەگەڵ پێشەوایەکیتر لە پێشەواکان یان زانستێك لە زانستەکان کردبا، ئەوانیش وەگەڵیان دەکەوتن. بێ دەنگیش نەدەبوون لە پاساو هێنانەوە بەوەی کە ئەوەی ئەوان پێیەوە خەریکن زانستی دینەو هیچ مەبەستیشیان نیە تەنیا نزیك بوونەوە لەپەروەردگاری جیهانیان نەبێ.[155]

---

[154] ئیمام غەزالی، ئیمامە موجتەهیدەکانی بە پێنج دەناوێ (سفیان الثوري) پێنجەمینیانە.

[155] احیاء علوم الدین (٤١/١ و دوای ئەو) الباب الرابع في سبب اقبال الخلق على علم الخلاف.

له خوێندنەوەی بیروراکانی ئەو دەقە تێدەگەین کە:

١. ئیمام غەزالی رەحمەتی خـودای لێـبێ دەو وشـانەیدا دەسـتی لەسـەر دەردی هەقیقی داناوە کە توشی ئوممەت بووە لە ئەنجامی ئەو لێکترازانـە شـومەی دوای جێنشینە سەر راستەکان کەوتبوە نێوان هەردوو سەرکردایەتی: فیکری و سیاسـی، مێژومـان تێهەلکێشـی ئـەو شـەقلە بـوو کـە تـا ئێسـتاش پێـیـەوە گرفتارین. تا ئەوەی هەڵسوکەوتی سیاسی نا ئیسلامی پەیدا بوو، ئەویش لە بێ ئاگایی سیاسیەکان لە سیاسەتی شەرعی ئیسلامیەوە سەری هەڵداوە... فیقهی نەزەری گریمانیمان هەیە کە پەیوەستی بە کێشەکانی خەڵکەوە نییە و چەڵمەی رۆژانەیان بەو رێگە کارایە چارەسەر ناکا وەك کە پێشتر لە چەرخی هاوەڵان و تابعیـیان هـەمان ئـەو کێشـانەی چارەسـەر دەکـرد، زۆربـەی کێشـە فیقهیەکان و مەسەلە ئوصولیـەکان تـەنیا چـەند کارێکی گریمانین لە ئەنجامی مونازەرات و دەمەتەقێ و کێشە خیلافیەکان پەیدا بوونە.

٢. پاش ئەو هەڵسوکەوتە هەڵانە، فیقهـ، لـە هۆیـەکی رێکخـەری ژیـان و واقیعـی خەڵکان دەگەڵ زەوابتەکانی شەریعەت، گۆردرا بۆ هۆیەکی پاساو هێنەر بۆ واقیعی داواکراو، ئەو واقیعەش هەر چۆنێك بێتە ئەو ژیانە تەشریعیە جۆرە رارایی‌یـەکی نـامۆی لای موسـوڵمانەکان خسـتەوە، هـەر بۆیـە زۆر جـار تاکـە شتێك بۆ تاکە کەسێك لە کات و شوێنێکی تایبەت لای فەقیهێك حەڵاڵ بووە و لای یـەکێکی‌تر حـەرام. بەسـە بـۆ ئـەوە کـە بنەمایـەك لـە بنـەماکان و دەرو (باب)ێکی فراوان لە دەروەکانی فیقهـ بـە دەرو (بـاب)ی (المخـارج و الحیـل)[١٥٦]

---

١٥٦ المخارج والحیل: بە لصلێك لە لصولەکانی حەنەفی دادەنرێ. پێشەوا موحەممەدی کوری حەسەن کتێبی (المخارج والحیل)ی نوسیوە، پاشان خەڵکان زۆر بە خێرایی فراوانیان کرد. بنۆرە: باب الحیل: اعلام الموقعین و کتێبی: الحیـل في الشـریعة الاسـلامیة: محمـد بحـوی (نامـەی دکتوراە)



ناسـراوه تـا وای لیهـات پیتۆڵـی و لێهـاتویی لـهو دهروهدا، بهڵگـه بـێ لهسـهر فراوانی فیقهی فهقیه و پێگهیشتویی و زیرهکی فهقیه بهسهر غهیری خۆیدا. تا دهمـان بـهرهو پێـش دهچـوون، دهسـهڵاتی دین بهسـهر خـهڵکدا بـێ هـێز و کـار ئالۆزتر دهبوو..خهڵکان لهباری شهرعدا ئاسانگیریان دهکرد.تـا کار لای فـهتوا دهران گهیشـته ئـهوهی بـێ بهڵگـه فـهتوا بـدهن. ههرچـهند بڕوایـان بهدروسـتی شتهکه نهبوو بهو گومانهی که لهوهدا ئاسانگیری یـان توندگیری لهسـهر خـهڵك زهمانـهتی نهبـهزاندنی حدودهکانی شـهرع دهکا، وهك هـهندێکیان مۆڵـهتیان بـۆ

---

ههروهها کهم کتێبی فیقهی ههیه ئاماژهی بۆ (باب الحیل) نهکردبێ. یان چهند شێوهیهکی (الحیل)ی له دهروهکانی فیقهـ باس نهکردبێ. وهك: معاملات ونکاح و تهڵاق و شتیتر ابن القیم له کتێبی: اعلام الموقعین عن رب العالمین، دهرویهکی فرلوانی بۆ کردوتهوه، لایهك له بهشی سییهم و چوارهمی کتێبهکهی پێگرتوه، چییهتی (الحیل) و جۆرهکانی و حوکمی ههر جۆرێکیشی روون کردوتهوه، نمونهی زۆری بۆ هێناوهتهوه وهك. (حیل)ێیهك بکوژ پهنای بۆ دهبا تا ههقی تۆڵه لهسهری لاچێ. بهوهی که ئهو کهسهی دهیهوێ بیکوژێ برینداری دهکا و پاشان دهرمانێکی ژههراوی دهداتێ یان برینهکهی ژههراوی دهکا، (حیل)ه بازان سهبارهت بهو حاڵهته دهڵێن حهقی تۆڵه لهسهری لادهچێ چونکه نابێته بکوژ. ئهوه (حیل)ێیهکی بهتاڵ و رهدکراوهیه. ههروهها که پیاو ویستی ژنهکهی له میرات بێ بهش بکا له کاتی نهخۆشی مردنیدا تهڵاقی دهدا. قازی له جیاتی ئهوهی لهو کاتهدا حوکمی تهڵاق بدا میراتی پێدهدا. چونکه تهڵاق له کاتی نهخۆشی مردندا ناکهوێتێ (حیل)ێبازان دهڵێن: مێرد دهتوانێ لهسهرهخۆی ئیقرار بکا که سێ بهسێ تهڵاقی داوه. ئهوهشیان (حیل)ێیهکی بهتاڵه ههروهها ههندێك دهوڵهمهند بۆ ئهوهی زهکاتیان لهسهر لاچێ به فێڵ ماڵهکهیان دهبهخشن. یان پێش هاتنی کاتی زهکاتدان دهیفرۆشن، یان زهکاتهکهیان دهخهنه نێو تورهگه یان دهفرێك و بهههژارێکی دهبهخشن. وا دادهنێن که زهکاتیان داوهتێ پاشان به کرینهوه لێی وهردهگرنهوه. ئهوانه ههموویان کاری حهرامن. مرۆڤ مامهڵهی دهگهڵ زانای لێزانه که شارهزای ناپاکی چاوهکان و نهێنی دڵهکانه.

هەندێك لە كاربەدەستان دەدا لەوەی كە بۆ خەڵكی گشتی مۆڵەتی تێدا نەبوو.[157]

ئەگەر لەمەڕ شكانی دەستنوێژ لە دەست لێدانی ئافرەتو دەست لە زەكەردان لە یەكیانت پرسیبا دەیگووت: لای ئەبو حەنیفە دەستنوێژی پێ ناشكێ.

ئەگەر پرسیاری یاری شەترەنج و خواردنی گۆشتی ئەسپ كرابا دەیگوت لای شافیعی حەلاڵە.

ئەگەر پرسیار لە ئازاردانی تاوانبار یان بەزاندنی سنوور لە تەمێدادان كرابا دەیگوت: مالیك بە رەوای داناوە.

ئەگەر ویستی فێڵ بۆ كەسێك بكا لە فرۆشتنی وەقفێك پاش تێكچوونی و لە كەڵك كەوتنی، وەلیەكەش نەتوانێ چاكیكاتەوە، لەسەر مەزهەبی ئەحمەد فەتوای رەوا بوونی فرۆشتنی بۆ دەدا، تا وای لێهات بە تێپەڕینی چەندان ساڵ ئەوقافی موسوڵمانان لە وەقفەوە بۆ موڵكی تایبەتی گۆڕدرا.[158]

ئاوا بەنەمانی تەقوای خودا، ئامانجەكانی شەرع نەمان و بنەما گشتییەكانی فەرامۆش كران، تا كار گەیشتە ئەو ئاستەی شاعیرانی چروك و هەرزەگۆ و بێبەند و بار، گاڵتە بە حوكمی خودا بكەن، ئەوەتا ئەبو نەواس دەڵێ:

| | |
|---|---|
| اباح العراقي النبيذ و شربه | وقال حرامان المدامة و السكر |
| وقال الحجازي الشرابان واحد | فحلت لنا من بين قوليهما الخمر |
| ساخذ من قوليهما طرفيهما | واشربها لافارق الوازر الوزر |

ئێراقی خواردنەوەی بادەی موباح كرد و گوتی بەردەوامی و سەرخۆشی حەرامن

---

١٥٧ بنوڕە: مناهج الاجتهاد في الاسلام لسلام مدكور (٤٥٠-٤٥١) واصول الاحكام: حمد الكبيسي (٣٩٠).

١٥٨ الارتسامات اللطاف: شكيب ارسلان.

حجازی گوتی هەردوکیان یەکن لە نێوان قسەی هەردووکیان شەراب حەڵاڵ بوو.

لە قسەی هەردووکیان لایەکی وەردەگرم و پێکهەڵدەدەم تا بۆم دەرکەوێ کامەیان لە کامەیان خراپترە.

سووکایەتی بەو پیاوانە کرا کە کرۆکی دین دەپارێزن، دین لەلای خەڵکان سووک کرا تاوای لێهات بەزاندنی سنورەکان کارێك بوو خەڵکی بەبیانووی ئاسانگیری پێی رازی بوون، ئەوەش کاری هەندێك لەو موفتیانە بوو کە دیواری هەیبەتیان رووخاند و فەتوادانیان لەوەی کە نەفسیان دەیەوێ بۆخویان موباح کرد. ئەوەبوو دەستەیەکی رەق و توونـد لـە بەرامبەریان وەستـا و هـەوڵی‌دا وەدوای توندترین و سەختترین گووتان دا بگەرێ تا فەتوای بۆ فەتوا خوازان پێبدا، بەو گومانەی لەوەدا خزمەتی ئیسلامە و خەڵکی بۆ سەر کارکردن بەعەزیمەکانی دەگێرێتەوە، بەلأم کار بەو جۆرە نییە، ئاکام -هەردەم- وەك چاوەنور دەکرێ وا دەرناچێ، زۆر جار پێچەوانە روودەدا، خەڵکی لە شەرع رادەکا و رازی نابێ مل کەچی بێ، لە جیاتی ئاسانی سەختی تێدا دەبینن، هەروەك لە بەسەرهاتی مەلیکی ئەندەلوس دا کە لە موفتی مالیکی: یحیی کوری یحیی[159] دەپرسێ: چ پێویستە لەسەری بیکا بۆ کەفارەتی چونە لای هاوسەرەکەی لە رۆژێکی رەمەزاندا. وەڵامی دەداتەوە کە پێوستە لەسەری دومانگ لەسەریەك بەرۆژی ببێ و بۆی نیە شتێکی‌تر بکا. دەبوو یەکەم جار فەتوای بە ئازادکردنی کۆیلەیەك دابا، بەلأم کە پرسیان بۆچی ئەو فەتوایەت دا، گوتی: ئەو دەتوانی سەدان کۆیلە ئازاد بکا بۆیە پێویستە زەحمەتەکەی بکا کە رۆژو گرتنە. ئەگەر بۆ واقعیەتی ئیسلام بگەرێینەوە و ئاسانی

---

159 يحيى بن يحيى الليثي الاندلسي: راوي الموطأ عن مالك وناشر مذهبه في المغرب، توفي سنة (٢٣٤ هـ) انظر: البداية (١٠/٣١٢).

و رشت بوونی لەسەر ئەوەی کە دەیەوێ وەلامگۆی خەڵکان بۆ حوکمەکانی وەلامگۆیەکی خودی و فتری و دڵخواز و بێ سەختی و زەحمەتی بێ. لەهەمان کاتدا بوار نادا خەڵکی ئەوەندە سەربەست بن سواری ئەسپی ئارەزوو بن. ئەگەر وامان کرد بۆمان دەردەکەوێ کە هەردوولا بە هەڵە چوونەو لە مەبەستی یاسادانەری لێزان تێیان پەڕاندوە. ئەرکی زانا گەیاندنی پەیامی خودای بەرزە بە خەڵکان وەك چۆن خودا لە کتێبەکانی دایبەزاندوە و بە پێغەمبەرەکانیدا ناردوویەتی، بۆی نیە سەختگیری یان ئاسانگیری تێدا بکات.

﴿قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللَّهَ بِدِينِكُمْ . . .﴾ الحجرات: ١٦

﴿. . . قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ﴾ البقرة: ١٤٠ عیبرەت بە شوێن کەوتنە، ئەوەی تێپەڕچێ داهێنراوە. جا چ لەلایەنی سەختگیری یان لەلایەنی ئاسانگیرییەوە بێت یەکسانە.

## لاساکردنەوە و ئاکامەکەی

لەوەی تێپەڕی بینیمان چۆن کاری ئیجتهاد بەو شوێنە گەیشت کەپێی گەیشت. زۆر لە پیاوچاکان لەوە ترساون کەسانی نەشیاو لە دەرگەی ئیجتهاد بدەن، کەسانێك روویان کردە فەتوا دان بۆ بەردەمی سوڵتان و گەیشتنە ئەوەی ملی دەقەکانی شەرع لارکەنەوە بۆ ئەو لایەی کە ئارەزوویان مەیلی لێیەتی. زانایان لە نێوان مۆڵەتدەر و سەختگر جیاوازیان تێکەوت. ساڵحانی ئوممەت لە چارەنووسی ئوممەت و دینەکەیان ترسان و دەستیان کردە گەڕان بە دوای چارەسەر. هیچ دەروویەکیان بۆ رزگاربوون نەدۆزییەوە تەنیا رێگەی پابەندبوونی ئوممەت بەلاساکردنەوە نەبێ، وای بۆ ئەو تەنگژەیەی کە رێگەی رزگاربوون لێی لاساکردنەوە بێ!

کۆبوونەوە و دەمەقاڵێی نێوان زانایان و بەردەوامی دژایەتی و مل پێچی و ناڕازی بونیان وایکرد کەتاکە ڕێگەی ڕزگاربوون لە دەبەدەمەی مەسەلە خیلافییەکان، گەڕانەوە بۆ ڕاوگوتاری پێشەواکان بێ.

هەروەها خەڵکان متمانەیان بەزۆربەی قازییەکان نەما لەبەر نزیکیان لە سوڵتان و ڕووکردنە دونیا و بێدادیان لەزۆربەی حوکمەکان دا، وایان لێهات ئەگەر حوکمی قازی هاوکۆکی گوتەی یەکێك لە چوار ئیمامەکە نەبوایە متمانەیان پێی نەدەبوو. بەم جورە لاساکردنەوە و پابەند بوون بە گوتەکانی ئەو چوار ئیمامە لەهەموو ئەو شتانەی باسیان کردووە و دەرهێنانی ئەو شتەش لە گوتەکانیان کە باسیان نەکردوە، لای جەماوەری موسوڵمانان زەمانەتێکی بەهێز بوو بۆ تووش نەبون بە ئیجتهاداتی لاڕێ کە لە کەسانی خۆ نەپارێزی هەڵگری زانستە شەرعیەکان دەردەچێ بۆ خزمەتی مەبەستێك و دەستخستنی ئارەزوویەك، ئەوەبوو پێشەوا الحرمین (وەفاتی ٤٧٨ك) داوای ئیجماع کرانی توێژەرانی کرد لەسەر قەدەغەکردنی لاساکردنەوەی گەورە پیاوان لە هاوەڵان، بەڵکو لەسەریانە شوێنکەوتەی مەزهەبی ئیمامەکان بن کە سەرنج و دیقەتیان داوە و چەندین دەرو (باب)یان داناوە و باری مەسەلەکانیان باسکردوە و مەزهەبی پێشینەکانیان هێناوە، پاشان جەختی لەسەر ئەوە کرد و بەو حوکمە غەریبە کوتایی هێنا کە عەوام فەرمانی پێدراوە کە شوێن کەوتەی مەزهەبی سەرنج دەران بێ.[١٦٠]

لەسەر ئەو گوتەیەی پێشەوا الحرمین و داوای ئیجماعی توێژەران، ئیبن صلاح (٦٤٣ك) داوای خۆی لەسەر واجبی لاساکردنەوەی چوار ئیمامەکە بنیاد نا، بۆ ڕێکخستن و نوسینەوەی مەزهەبەکانیان و نوسینەوەی مەرجەکانیان و شت گەلێ کە

١٦٠ البرهان (٢/١١٤٦)، فقه ١١٣٧) التقرير والتحبير (٣/٣٥٣).

بیجگە لەوان بۆ مەزهەبی هاوەڵان و تابعیەکانیتر[161] نەرمخسا. دوای ئەوە پاشینەکانیش لێیەوە نەقڵیان کرد[162]. لێرەوە کەمتەرخەمی خەڵکان بەرامبەر قورئان و زانستەکانی و مل پێچیان لە سوننەت و ڕێبازەکانی دەستی پێکرد، لە چاکترین بارودۆخ دا هەر تەنیا بە زانستی نەقل کردنی گوتە و مەزهەبەکان و دامەزراندنی و بناغە دارشتنی و دەمەقاڵێ لەسەری و پەل و پۆدارکردنی و لێدەرهێنانی، رازی بوون.

لێژەرۆیی بەردەوام بوو، خیلاف سەخت و قوڵتر بوو. لەدوای ئەوە چەندین سەدە باوی لاساکردنەوەی رەها بوو، بزاڤی فیکر چەق وەستا، داری ئیجتهاد وشك بوو، ئاژاوە بلاو بۆوە و نەزانی سەرتاپای داگرت؛ وای لێهات زانای فەقیهـ -لەبەر چاوی خەڵك- کەسێك بێ کە کۆمەڵێ گوتەی فەقیهەکانی لەبەرە و ژمارەیەك بیرورای لا هەیە، بێ ئەوەی جیاوازی لەنێوان بەهێز و لاوازیان بکا، فەرمودە ناسیش کەسێکە کۆمەڵێ فەرمودەی تەواو و ناتەواوی لەبەرە.

خۆزگە کار هەر لەو سنورە دەوەستا، بەڵکو حاڵ لەو ئاستە نزمە بۆ نزمترین دابەزی. هەروەك خۆری زانست لە جیهانی موسوڵمانان ئاوا بووبێ و فیکریش نەزۆك، بازاری بیدعە برەوی سەند، کالای لەرێ لادان وەرمینی کەوت، خورافات پەرەی سەندو شێوەی جۆر جۆری وەرگرت، تا رێگەی بۆ هێرشکەران خۆش کرد شارستانیەتی ئیسلامی رامالن و وڵاتی ئیسلام بۆ خۆیان بە رەوا بزانن.

---

161 بنوڕە: التقرير والتحبير (٣/٣٥٣).

162 بنوڕە: التقرير والتحبير وشرح جوهرة التوحيد تحفة المريد (١٥٢).

## حاڵی ئوممەت لەچەرخەکانی دوایی‌دا

ئەوە حاڵی ئوممەت بوو کە دەباوەشی لاساکردنەوە وەنەوزی داو دەخەونی رابردوی شکۆداری دا نووست، هەر لەکاتی لیکترازانی شومی نیوان فەرمانرەواکان و سەرچاوەکانی شەریعەتی ئەو ئوممەتە روویدا، هەوا و ئارەزوو ئەمبەرو ئەوبەری بەخەڵکانی سەر گەردان دەکرد. زانایانی ئوممەتیش لێیان بێئاگا بوون. هەرکەسێ بەچی خەریك بوو ئەوی پێ راست بوو، ئەگەر کەسێ سەرنج بداتە کەلەپوری ئوممەت وای لێدێ باوڕ نەکا چۆن ئەو پاشینە مردوە بە بەرد بووانە لەو پێشینە زیندوە رووناکی بەخشانەن. کاتێ راپەرینی نوێی ئەورووپا سەری هەڵدا، ئوممەت لەسەر ئەو حاڵە بوو، ئەورووپی‌یەکان ئوممەتێکیان لەبەرامبەر خویان بینی چ بنەمایەکی راستەقینەی نەمابوو جێی باس بێ:

عەقیدەیەکی خاو، ئیمانی زۆریەیان لەرزاو، یەقینیان وەك یەقین نەمابوو، ئاکارێکی لاڕێ، نەچەسپاوی لە کاردا، بیرێکی بەستەڵەك، ئیجتهادی لە کار کەوتوو، فیقهێکی ون بوو، بیدعەی لە ئارادابوو و سوننەتی نوستو و هوشیاری نادیار، وەك بڵێی ئوممەت ئەو ئوممەتە نیە، ئەو حاڵەتە ئەوانەی خەڵەتان کەپەنایان لە ئوممەت گرتبو. خۆرئاوایی ئەو هەلەیان قۆستەوە، ولاتیان داگیر کرد. جڵەوی ئوممەتیان گرتە دەست و دەستیان گرت بەسەر باقی پاشماوەی بنەماکانی کەسێتی ئوممەت، تاکو حاڵ بەو رۆژە گەیشت کە ئێستا ئیمەی تێداین، زەلیل و زەبوون...کلیلی کارەکانمان کەوتە دەستی دوژمنانمان بریاری چارەنوسمان بدەن، چارەی چەڵەمەیەك کە خۆمان دروستمان کرد و بەدەستی خۆمان پێکمان هێنا لەوان داوا بکەین.

لەو میانەدا ئوممەت بەوەندە پرشنگی ژیانەی تێیدا ماوە هەوڵی دا لەگەلان هەستێتەوە و لە هەڵەنگوتنی راستبێتەوە. هەموو هەوڵەکانیشی بە شکانێکی سەخت

کۆتاییان هات، چونکە ڕێگەکانی گەیشتن بە سەرکەوتنی هەڵە کرد و سەرپێچی سوننەتی خودای کرد. هەموو هەوڵەکان سەرەتاگەیان بە لاسایی بێگانە و پاشکۆی داگیرکەر دەستی پێکرد تا حاڵی خراپتر بوو. ئەوەبوو نەوەی نوێی ئوممەت بۆ دۆزینەوەی چارەسەری دروست و گەڕان وە دوای هەتوانی سارێژکەر کەوتنەخۆ. دەستە گەلێکی چاك لەڕۆڵەکانی ئوممەت هەستیان کرد کە: (بنەتای ئەو ئوممەتە ساز نابێ تەنیا بەو شتە نەبێ کە سەرەتاکەی پێی ساز بوو) ڕوویان کردە ئیسلام و لەکانیە زوڵاڵەکەی بەراویان هەڵبەست. کردەوەی ئەوانە بە زاراوەی (ڕابوونی ئیسلامی) ناوزەد کرا، دوژمنانی ئیسلام بە جیاوازی ڕێچکەیانەوە ڕێنادەن گورەپان بۆ ئەو بانگەوازە پیرۆزە چۆل بێ. چەکیان زۆرە بۆ جەنگی بەکاری بێنن -هەندێك ڕۆڵەی هاورەگەزمان کە دەمنێو خۆماندا دەژین لەو چەکانەن- بە جۆری هەندێکیان لایان ئاساییە ببنە پاچی ڕووخێنەری دەستی دوژمنانی ئوممەت، ئەوەش لەو دەزگایانەدا خۆ دەنوێنێ کە گزی و فزی لەو کۆمەڵە باوەڕدارە دەکەن و بۆ کوسپ دانان لە ڕێگەی گێڕانەوەی ژیانی ئیسلامیانە جۆرەها چەك بەکاردێنن، ترسناکترین ڕکابەری ڕووبەڕووی ڕابوون دەکەنەوە، لە نێو ئەو ڕکابەرییە زۆرانەشدا ڕکابەری بەد و شومی -ئیختیلاف-ە ڕووبەڕووی ڕابوون دەبێتەوە، ڕکابەرییەکانی تر جگە لە ئیختیلاف بەسن بۆ بەفیڕۆدانی هەوڵی کارکەرە دڵسۆزەکانی. ئەمە و زۆر لە هەوڵەکانیش لەسەر سەکۆی شومی ئیختیلاف پەرت و بڵاو دەبن: دەبینین دەستە لاوی ڕودەکەنە سەلەفیەت، هەندێکیتر ڕوودەکەنە ئەهلی فەرموودە، تاقمێك بەرەو مەزهەبگەرێتی و پێرێك بانگەشەی نامەزهەبی دەکەن. لە نێوان ئەمان و ئەوان دا تۆمەتی جۆر جۆری بە کوفرکردن و بەفاسق دانان و بیدعە سازیو لە ڕێ لادان و بەکرێگیراوی و سیخوری و ...هتد. ئاڵوگۆڕ دەکرێ، کە بۆ موسوڵمان ناشێ بە هیچ جۆر بیانداتە پاڵ براکەی، ویڕای ئەوەی بە هەموو هۆیەکی بەردەستی بێئاگایی یان

خۆ بێ ئاگا كردن بە خەڵكی رادەگەیەنی. ئەوەی ئیسلام رووبەرووی دەبێتەوە كە هەوڵی ریشەكێش كردنیەتی لە هەموو ئەو ئیختیلافانە ترسناكترە. ئەگەر هۆكەڵی ئیختیلافی پێشەوا موجتەهیدەكان پاساوی ئیختیلافەكەیان بێ و لە شوێنی ئیختیلافیان كەم كاتەوە و یارمەتیدەربێ بۆ دانانی ئیختیلاف لە بازنەی مەرجەكانیدا، ئەوا ئیختیلافكارانی هاوچەرخ تاكە هۆیەكی ماقوڵیان لە هۆیەكانی ئیختیلاف نیە، خۆ ئەمانە موجتەهیدنین، هەموویان لاساكەرەوەن، ئەوانەشیان دەگەڵ دەبێ كە لافی وەلانان و نەفی كردنی لاسا كردنەوە لێدەدەن. گوایە ئەوانە بێ لاساكردنەوە راستەوخۆ حوكم لە قورئان و سوننەت وەردەگرن. لە راستی دا ئەسەر چەند كتێبێكی فەرمودە قەتیس ماون و لەهەر شتێكی دەربارەی فەرمودە و پلە و پیاوەكانی فەرمودە لاسایی نوسەرەكەی دەكەنەوە و لە هەموو ئەو شتەی لەو كتێبانە هەڵی دەگۆزن یان لە فەقیهەكانەوە دەیهێنن دوایان دەكەون. زۆربەیان مێژو و ناسینی پیاوانی فەرمودە و زانینی پلەكانی (الجرح والتعديل) دەدەنە پاڵ خۆیان. كەچی پێناچی تاكە كتێبێكیان ئەم و ئەو بابەت سەبارەت بەوانەوە خوێندبێتەوە، بە رەوای دەزانن سەركەونە سەر مینبەری ئیجتهاد و فیز بە سەر خەڵكانەوە بكەن. هەق وایە ئەو كەسەی پشكی زانستی بەركەوتووە، زانستەكەی رێگەی پێ نەدا ئاوا لە نەفامان بێت و بگاتە ئاستی دابەش كردنی لەقەب و تومەت باركردنی خەڵك. وە هەست بەو مەترسیە بكا كە توشی عەقیدەی ئوممەت دەبێ و كاربكا بۆ بەربەست كردنی و رشت بێ لەسەر كۆكردنەوەی دڵەكان. مادام هەموویان لاسایی پێشەواكانیان دەكەنەوە و بە جیاوازی گوتەكانیانەوە لێیان وەردەگرن-ئەگەر گومانی غەیری ئەوەش بەرن - هەر هیچ نەبێ با پابەندی ئەو ئەدەبی ئیختیلافە بن كە ئیمامە بەڕێزەكانی سەلەف لەسیبەری دا ژیاون.

باورداره دڵسۆزەکان ئومێدەوار بوون ئەو رابوونە پاکە هەنگاو بنێ بۆ پڕ کردنەوەی ئەو چاڵە قوڵەی کە فیکری کوفر و بێ باوەڕی و عەقیدەی پوچەڵی لادەر هەڵیقەندوە لە کیانی ئەو ئوممەتەی کە شەیتانەکان عەقل و دڵی زۆر لە رۆڵەکانی بەنگ کردوە، دڵیان لەو ژەنگە پاك بکاتەوە و عەقیدەی دروستی ئیسلامی بێتە شوێنێی، پاشان بە پەیامی خوداوە بەرەو جیهانی بەرفرە تەکان بداو وشەی (الله) لە زەوی دا بەرز بێتەوە. بەلام جێگەی خەمە کە هەندێك لە رۆڵەکانی موسوڵمان بۆ شکاندنی باڵی رابوون کاردەکەن و لەسەر کاروباری موستەحەق و نا موستەحەق بە کوت و بەندی خیلافی نارێك دەیبەستنەوە. کارێکە کە موسوڵمانانی بە خۆیانەوە خەریك کردوە و زۆر لە تواناکانی بە فیڕۆ داون و شتەکانی لەبەر دەمیاندا زۆر سەیر تێکەڵ کردوە. وای لێکردوون جیاوازی لە نێوان بچوکترین و گەورەترین، ئاسانترین و سەختترین کاروباردا نەکەن. جا چۆن گەلێ ئەوە باریان بێ، دەتوانن چارەسەری کێشەکانیان بە پێی گرنگی بکەن و کاریان بەشێوەیەك رێك بخەن کە بەسەر گێرانەوەی رەورەوەی ژیانی ئیسلامیانەدا توانادارییان بکا؟!

وروژاندنی خیلافی نێوان موسوڵمانان، یان گەشەپێدانی هۆکارەکانی، خیانەتێکی گەورەیە بە ئامەنجەکانی ئیسلام و تێکدانی ئەو رابوونە هاوچەرخەیە کە ئومێدی لە دڵەکاندا ژیاندوتەوە. کۆسپ دانان لەسەر رێڕەوی ئیسلام و پەرت کردنی هەوڵی کارکەرە دڵسۆزەکانی، خودا رازی ناکات، هەر بۆیە ئیمڕۆ دوای باوەڕ بە خودای بەرز، چاکترین و گرنگترین واجبی موسوڵمانان بە گشتی و -بانگەوازکاران بە تایبەتی- ئەوەیە: کاربکەن بۆ یەکێتی گروپەکانی بانگەوازکار و هەڵگرانی ئیسلام و دەستگرتن بەسەر هەموو هۆکانی خیلافی نێوانیان، ئەگەر ئەستەمیش بێ با هەر لە سنوریکی تەسك و لە چوار چێوەی ئادابی پێشینە چاکەکانمان دەبێ. ئیختیلافی رایەکان رێگر نەبێ بۆ پێك گەیشتنی دڵەکان بۆ گێرانەوەی ژیانێکی ئیسلامیانەی

بەرێز، مادام نیەتی ساغ هەبێ بۆ ڕەزامەندی خودای بەرز، ئەوا ئومێدی سەرکەوتن و پشتگیری خوداش هەر دەبێ.

## هۆیەکانی ئیختیلافی ئیمڕۆ

بێگومان هۆیەکانی ئیختیلاف بەپێی چەرخەکان دەگۆڕێن، گەرچی هەموو چەرخێك هەندێك هۆی لێدەبێتە میراتی چەرخەکانی دوای خۆی. دیارترین و گرنگترین هۆکانی ئیختیلافی ئیمڕۆی نێو موسوڵمانان: نا شارەزایی یان کەمی زانستە لە ئیسلام.

باری زانستی وڵاتی موسوڵمانان پێش ئەوەی داگیرکاری کافر بێتە ناوییەوە ئەوەبوو کە باسمان کرد. بەڵام پاش ئەوەی هاتە ناو خاکی ئیسلام ئەوا کار پتر تێکچوو، داگیرکاران زانیان نهێنی چاکی ئەو ئوممەتە دەکوێییدایە. ڕوی گرنگی دانیان کردە دانانی بەرنامەی فێرکردن و بنیادنانی دەزگاکانی خوێندن بەو ڕێگەیەی کە زەمانەتی گۆڕانی عەقڵی موسوڵمانان و بیروڕایان بۆ بکا تاکو بۆ وەرگرتنی بارو بیری نوێی جیهانی ئامادە بێ و هەوڵدا دەگەڵی بگونجێ. بە گومانی داگیرکارانی کافر، ڕازی بوونی موسوڵمانان بەو واقیعە نوێیە، پاڵنەر دەبێ بۆ پلەکانی سەرکەوتن و پێشکەوتن بە بەراورد دەگەڵ وڵاتانی ئەورووپی کە هەنگاوی جدییان بەرە و پایەکانی شارستانیەت نەبری تەنیا دوای یاخیبونیان لە حوکمی دینی و ڕزگاربونیان لە ژێر نیری کەنیسە نەبێ. دینیش -بە گومانی ئەوان- تەنیا کۆتێکە ڕێ لە دەرچوونی مروڤ بەرەو نیعمەتی چاوەنورکراو دەگرێ: ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ إِنْ يَقُولُونَ إِلَّا كَذِباً﴾ الكهف: ٥ ئەگەر ئەو پڕوپاگەندانە لەبارەی دینە شێویندراوەکانی ئەوان ڕاست بێ ئەوا ئەستەمە لەبارەی

ئەو ئیسلامە راست بی کە خودا ویستویەتی مروڤایەتی پی خوشبەخت بکاو هەموو ئاواتەکانی پی وەدی بینی لەو کاتەی کە بە نوری خودا هەنگاو دەنی.

داگیرکاری بی دین لە هەولی دابرینی ئوممەت لە هویەکانی بوونی و ژیانی ئیسلامیانەی، هەرچی تەگەرە و کوسپە لەبەردەم خویندنی ئیسلامی دانا، بو گەیشتن بەو ئامانجەی هەموو ئەو خویندکارانەی بواری خویندنی ئیسلامیان هەلبژارد فەراموشکران و ئەو فیکرانە پەخشکران کە لە شەوکەتیانی کەم دەکردەوە و سوکایەتی بە خویندنیان دەکرد تا وایان لیبکەن شایانی کارکردن لە نزمترین پلە و پایەدا نەبن، لە بەرامبەردا ئەو خویندکارانەی رویان کردە خویندنگە تازەکان و لەوی دەیانخویند چاودیری و ئاگاداری تایبەت دەکران و دەرگەی دوارۆژی پرشنگداریان بو دەکرایەوە و پایە گرنگەکانی دەسەلات بو وان تەرخان دەکرا، ئاوا تەنگیان بە خوازیارانی خویندنی ئیسلامی و زمانی عەرەبی هەلچنی و هەمو رینگەکان بو ئەو مەبەستە داخران، کەس نەما بو ئەو مەبەستە بیتە پیش تەنیا خویندکارانیکی کەم نەبی، ئەوانیش بەردەوام روبەروی تەنگەتاوکردن دەبونەوە، کە دوور نەبوو لەهەر قوناغیک لە قوناغەکانی رینگەناچاری پاشگەزبونەوەیان بکات، ئەوەیشی لەسەر بەردەوام بوون پیدادەگری -هەردەم- جورەها جیاکەرەوە لە نیوان خوی و خەلکانیتر ببینی، هەروەك گوتمان. لە کار و فرمان و پلە و پایە وای لیدەکا هەست بە ستەم و کەمی توانا بکا. بویە خویندنی ئیسلامی لە زوربەی ولاتانی ئیسلامیدا خوازیاریان کەمە و ئاستی زانستیان نزمە، زوربەی ئەوانەی پیشوازی لیدەکەن، وەك ئەوەن زەوی دابچینن و ئومیدی دورینەوەی بەرهەمیان نەبی، تەنیا بارودوخی تایبەت پالنەریانە بو ئەو جورە خویندنە. تاکو دوای دەرچونیش توانای رزگاربونیان لە فشاری ئەو دوخە نییە بە جوریك رینگەی بەردەمیان گیراوە، توانایان نییە ئەو رولە بگیرن کە دەبی زانا لە کومەلگەدا پیی

هەڵسێ و پەیامی سەرشانی بە جێ بگەیەنێ، لەبەردەم دەرگە داخراوەکاندا سەربەخۆیی خۆیان لەدەست دەدەن و کەسێتیان لە دەست دەچێ و ناچاری چونە نێو دەزگا دینیە رەسمیەکان دەکرێن، کە پێشتر بۆ خزمەتی ئامانجێکی داڕێژراو، ئامادەکراون و مەبەستیان سنوورداره و ناتوانن لێی تێپەڕ کەن. بە جۆرێك نێوبەند لە نێوان ئەوان و راپەڕاندنی رۆڵیان لە کۆمەڵدا دادەنرێ و خەڵکیش متمانەی بەرامبەریان لە دەست دەدەن.

داگیرکاری بێ دین لە هەوڵێکیدا بۆ قوڵترکردنی چاڵی نێوان ئوممەت و عەقیدەکەی و بە هیوای بڕینی ئەو رەگەی بە شەریعەتەکەیەوە دەیگەیەنێ. هەوڵیدا خوێندنی ئیسلامی و فێربوونی زمانی عەرەبی وەلانێ و گۆڕەپان بۆ ئەو فیکر و رێبازانە چۆڵ بکا کە خۆی هەڵیدەبژێرێ. رێگەی وەدوا کەوتنیشیان بۆ لاوانی ئوممەت رازێنرایەوە، لاوەکانیش لە دەرك و داڵ زیاتر چێتریان نەدۆزیەوە و لە زەقنەبوت زیاتریان نەچێشت. لاوی موسوڵمان هەموو ئەو جۆرە فیکرانەی جەرباند کە پێشکەشی کران، لە شیوعیەتی‌یەوە بۆ سۆشیالیستی و بۆ رادیکالی و بۆ قەومی و بۆ دیموکراتی و غەیری وانەی بۆی رازێنرایەوە لەو ئاومالك (و پوش و پەلاش)ەی زەبونی لەسەر زەبونی بۆ ئوممەتی ئیسلام زیادکرد، زەلیلیەکی زۆر زێتر لەوەی تێیدا بوو. دڵنیا بوو تەنیا ئیسلام توانای چارەسەری چەڵەمەکانی ئوممەتی هەیە و لە گلان راستی دەکاتەوە و دەست بەسەر هۆیەکانی پاشکەوتنی‌دا دەگرێ. دوای ئەوەی رێچکەکان گۆبەندیان پێکرد، رۆڵەی ئوممەت بڕیاری دا روو لە ئیسلام بکا و بەرەو ئیسلام رێگە بگرێ بێ هاورێیەك کە ترسی خۆی و دینەکەی لێی هەبێ. بۆیە کە چەڵەمەی لە دین تێگەیشتن و ناسینی حوکمەکانی تووشهات، پەنای بۆ کتێبان برد، بێ دیراسەیەکی مەنهەجی پێشتر، کە بۆ تێگەیشتنێکی راست یارمەتی بدا، هەروەها نەبوونی مامۆستایەکی لێهاتوو تا لە دیراسەی ئەو جۆرە زانستە نوێیە

دەستی بگری، لە ئەنجام دا ئەو لاوانە تەنیا لە میانەی ئەو کتیبانەی خویندویانەتەوە لە ئیسلام تیدەگەیشتن و لایەنیکی سنورداریان لە ئیسلام دەبینی کە فیکرەیەکی گشتگیری تەواوی لەبارەیەوە پی نەدەدان، ئەو توانایەی پی نەدەدان ئامانج و کولیاتی ئیسلامی پی بناسن و لە میانەی مەبەستەکانیەوە نیگایەکی دروستیان لی وەرنەدەگرت. بۆیە وە کۆمەلە نابینایەك دەچوون دەستیان بەر شوینگەلی جیا جیای ئەندامی فیل کەوتبی، هەر یەکیان وا دابنی فیل هەر ئەوەیە کە خوی دەستی لیداوە.

ئیمرۆ باری موسولمانان لە گەل ئیسلام بەم شیوەیە، ئوممەت بۆ چەندین تاقم و دەستە پەرتەوازە بووە. دەستەیەك پشت لە ئیسلام هەلدەکا و سواری گاریەی ئارەزو دەبی و لە نیوان خورئاوا و خورهەلات خول دەخوا. وەك ئەوەی هیچ شتیك بە ئیسلامی نەبەستیتەوە تەنیا ناویکی بە میرات ماو نەبی، ئەگەر لەبەر ئەو کەمە ئابرووەی نەبوایە کە ماویەتی لە ئیسلام بیبەری دەبوو. دەستەکەی‌تر گەرانەوەی ژیر ساباتی ئیسلام سوزی بزواندوە، بەلام ریگەی جیا جیا دەگریتە بەر و ئیختیلاف پەرتەوازەی دەکا، دوژمن دەروەستیان دی و گورزی سولتانیش لە ژیر هەموو ئاسمانی لە دویانە و هەول دەدا هەمو دەرگەکیان لیداخا، جا پیش ئەوەی قەدی راست کاتەوە لە ژیرەوە خاکبر دەکری.

## ریگەی رزگاری

ئیستا ئەو دەردەی ئوممەت پییەوە دەنالینی دیاری کرا، رەنگە لەوەی ژیرەوە شتیك لە چارەسەری تیدا هەبی:

**یەکەم:**

لەسەر ئەو موسولمانە دلسوزانەیە کە لە بواری بانگەوازی ئیسلامی کاردەکەن و دەگەل واقیع و هەقیقەتی کارەساتی ئوممەت دا دەژین، کۆمەلی لە رولە زیرەکەکان و لاوە لیهاتوەکانی ئوممەت هەلبژیرن، چاکترین ریگەی دیراسەکردنی

زانسته شەرعیەکانیان بۆ ئامادە بکەن. لەسەر دەستی ئەو پێرە کەمە و ئەوانەی ماون لە زانایانی شەریعەت کە زانست و پێشەنگی چاك و خۆپاریزی و فیکری دروست و تێگەیشتنی راستی مەبەستەکانی ئیسلام و ئامانج و گشتێتی و وەرگرتنی زانستەکەی دەگەڵ یەکتر کۆدەکەنەوە، ئەو کاتە شێوازی پەروەردەکردنی پێغەمبەرانە بکرێتە بەرنامەیان و ئەو لاوانەش دەستەیەکی‌تری دڵسۆز و بە تەقوا و بەتوانا لە زانستە جۆرا و جۆرەکانی سەردەم دەئامێز بگرن. بەڵکو پاش ئەوە هەردوودەستەکە رێرەو ئاراستە بکەن و رێنوێنی رابوون بکەن و هەڵەکانی هەڵگرن. تا ئوممەت کامەرانی و رۆڵی پێشرەوی مرۆڤایەتی بۆ بگەرێتەوە. ئەو مرۆڤایەتیەی کە رۆژ لە دوای رۆژ بەرەو دۆزەخ سەرەو ژێر دەبێ و رزگاربوونی بۆ نیە تەنیا بە ئیسلام نەبێ.

**دووەم:**

راستکردنەوەی رێرەوی فیکر لای موسوڵمانان. بە جۆرێ چارەی ئەو قەیرانە فیکریەیە بکا کە ئیمرۆ موسوڵمانان تێیدا دەژین و کەمێکیان نەبێ هەست بە مەوداکانی ناکەن. ئەو قەیرانەی لە میانەی داروخانی دامەزراوەکانی ئوممەت و نەمانی رێکخراوەکانی و دابەزینی ئاستی هۆشیاری و زانستی و پەروەردەیی رۆڵەکانی و لێك هەڵوەشانی پەیوەندیەکانی و بەلارێدا چوونی زۆربەی سەرکردەکانی و پەککەوتنی هەوڵی خێرخوازانەی دەستەیەك لە رۆڵەچاکەکانی بە ئاشکرا دەردەکەوێ. چونکە ئیسلام لە ژیانی ئوممەت دوور خرایەوە، چاڵێکی قوول کەوتە نێوان بنەماکانی ئیسلام و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. ئیسلام وەك هەورێك لە ئاسمان دەبینرێ نە بارانی پێوەیە و نە مردوان زیندو دەکاتەوە. وەك ئاوێکە لەسەر بەردێکی لوس، نە سەوزایی، نە رووەك دەروێنێ، دڵەکان رەق بوون و ژەنگیان بەسەر کشا، چاوەکان داپۆشران و ناتوانن خێر و شەر لێك جیاکەنەوە.

دامەزراوە جۆر جۆرەکانی فێر کردن پەکیان کەوت لەوەی مرۆڤی موسوڵمانی راست پێشکەشی ئوممەت بکەن، ئەو زانستگایانەی لەسەر شێوازی خۆرئاوایی لە وڵاتی موسوڵمانان دامەزراون، ئامادەکردنی زانای موسوڵمان لە گشت لقەکانی زانست بە ئەرکی خۆیان نازانن، کە بە ئیسلام کردنی گشت زانست و زانیاری لەسەر دەستی ئەودا دەبێ، بەڵکو وا دەبینێ کە ئەرکی ئەو: ئامادەکردنی فێرکارێکە شەیدای زانیاری و هونەری خۆرئاوا بێ و هەر زوو لە ژیانیدا پشت لە عەقیدە و ئامانج و مەبەستی ئوممەت هەڵکا. ئەو زانستگایانە وەچەیەکی لاوازی لە ئوممەت دور و لە پەیوەندی شێواو و لە فیکر شڵەژاویان دەرچواند کە دەستە پاچەن لەوەی زانستەکە بخەنە خزمەتی ئوممەت.

کەچی ئەو دامەزراوانەی سیفەتی شەرعیەتیان دراوەتە پاڵ، وەك ئەزهەر و وێنەی ئەو یان زانکۆ و پەیمانگەی هاوشێوەی ئەزهەر. ئەگەر بەشێوەیەکی سنورداریش لە پێشکەشکردنی تایبەتکارانی پێشکەوتو بۆ ئوممەت لە هەندێك زانستی شەرعی سەرکەوتوش بن، ئەوا دەستە پاچەن لە پێشکەشکردنی زانای موسوڵمانی سەرکردە و بیریارو نوێخواز کە بتوانن ئیسلام لە میانەی گشتێتی مەبەست و ویستەکانی پێشکەش بە ئوممەت بکەن کە روبەروی رکابەری سەردەم ببنەوە و بەسەریدا زاڵ بن. جا بۆیە فیکری ئیسلامی کورت هەڵاتوە و وانەبوە بەسەر ژیان و بیرکردنەوەی موسوڵمانان دا زاڵ بێ، عەقل و دڵیان بۆ هەموو جۆرە فیکرێکی جیاواز لە ئیسلام ئاوەڵا بووە، لە چارەسەری کێشەکانیان لە بوارگەلی سیاسی و ئابوری و رێکخستنی کۆمەڵایەتی و شتیتر وەستاون و پەکیان کەوتوە . هەر شتێ لە خەڵکانیتری دەبینن بە نەقل کردنێکی شێواو نەقڵی دەکەن. بەربەرەکانی جۆر جۆر لە هەمو بنەماکانی دا کەوتە نێوان رۆڵە رۆشنبیرەکانی ئوممەت، ئەو بەربەرەکانیەش زۆربەی بە قازانجی دەستەی غەرب زەدە و شەیدایانی

روشنبیری خۆرئاوا یەك لادەبێتەوە. لە جیاتی ئەوەی پێشەنگە باوەڕدارەكان ڕیزیان یەك خەن و بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو ڕكابەریانە كار بكەن (بەداخەوە) سەرگەرمی بەربەرەكانی و كێشە خیلافیەكان بوون. ئەوەش لەبەر ئەوەی لە مێشكی زۆربەی ڕۆڵەكانی ئوممەتدا (جزئیات) تێكەڵی (كلیات)و (مقاصد) تێكەڵی (مبادیء) كراوە.

ئێمە پێویستی زۆرمان بە فیكری ئیسلامی دروست و ڕاگیر لەسەر تێگەیشتنی ڕوحی ئیسلام و مەبەست و ڕێسا گشتیەكان و لەدوای یەكی حوكمەكانی هەیە لە میانەی هەردو سەرچاوە گەورەكەی: قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، هەروەك پێویستمان بە دیراسەكردنی ڕێگەی پێشینە چاكەكان لە ماوەی سەردەمی زێڕینیان دا هەیە لە مامەڵەیان دەگەڵ ئەو سەرچاوانە و شێوازی تێگەیشتنیان لە قورئان و سوننەت، تابتوانین تەرحی تێڕوانین و چارەسەری ئیسلامیانە بۆ ئەو شتەی ئوممەت پێیەوە گرفتارە دووبارە بكەینەوە، بە شێوەیەك وای لێبكا تەواو دڵنیا بێ كە ئیسلام تاكە ڕێگەیە بۆ ڕزگاركردنی و چاكترین چارەی بۆ هەموو چەڵەمەكانی تێدایە. ئەو دڵنیابونەی كە ئوممەت هەڵدەنێ بە هوشیاری و تێگەیشتنەوە لە دەورەی بنەماكانی فیكری ئیسلامی كۆ ببێتەوە و ڕێگەی شەیتانەكان بگرێ لەوەی بەنگی بكەن. جا ئەگەر ئوممەت كەوتەوە سەر ڕاستەڕێ و جێگیر بوو، دەستی لەسەر برینەكانی دانا و پەی بە نەخۆشیەكانی برد، دوای ئەوە هەر دەبێ ئەو هەنگاوانە دەست نیشان كا، كە پێویستە بۆ گەیشتن بە دەرمان و هاتنە دی ئامانجەكانی بیگرێتە بەر. ئەوەش شتێكە لێی بە دوور نازانرێ.

# كۆتایی

بۆ ئەوەی ئەو دوو ئامانجەی پیشوو بینە دی دەبی ئەو پێشەنگە باوەڕدارە وشیاری چەند كارێك بێ تا لە گەرانەوە سەرخۆی دڵنیا بێ:

١. زۆر گرنگە لاوی موسوڵمان هەست بەوە بكا. ئەگەرچی خودای بەرز و بە توانا قورئانی بۆ لێ وردبونەوە ئاسان كردوە و رێگەكانی شارەزابونی سوننەتی لە میانەی كتێبە زۆر و زەبەندەكانی بۆ هەمواركردوین، جا سود وەرگرتن لەو سەرچاوانە بە دەستپێشخەری تاكە كەسی زۆر وشیاری پیویستە، هەر دەبی پێشتر خۆی بۆ ئامادە بكری، پاشان بو ئەو كارە تویشومان ئەو شتانە بێ كە تایبەتكاران دیاریان كردوە. ناسینی مەرج و رێساكانی هەڵێنجان و شارەزایی و شێوازەكانی دەربڕینی زمانی عەرەبی و شارەزایی لە زانستی قورئان و سوننەت و ناسخ و مەنسوخ و گشتی و تایبەتی و گشتییەك كە تێیدا مەبەستی تایبەتكردنە، و موتڵەق و موقەیەد و زۆر شتیتریش، هەر گوتەیەك لە موسوڵمانێكەوە دەربچی بێ ئەوەی شارەزایی و زانستی لەو شتانەدا هەبێ، ئەوە گوتەیەكە لە دیندا بە حەز و بیرو و گوترەیەو بێ نور و ڕێڕونی و زانستە. ئەو كەسەی وای كرد سواری كەڵێكی سەخت بوو. خۆی بە هیلاك برد. پەنا بە خودا. پێغەمبەر ﷺ فەرمویە: (من قال في القرآن بغير علم فليتبوأ مقعده من النار) واتە: (هەركەسێ بێ زانست شتێك لەقورئان بڵێ باجێگەی خۆی دەئاگردا وەدۆزێ)[١٦٢] ئەو جۆرە زانستەش ناتوانرێ لەمیانەی

---

١٦٢ ترمذي لە كوری عەباسەوە بەسەنەدی سەحیح هێناویەتی وەك لە جامع الصغیردا (٢/٣٠٩) والفتح الكبير (٣/٢١٩) سێ لە اصحاب السنن هێناویانە بە گوتەی (من قال في القرآن برأيه فاصاب فقد اخطأ) واتە: (ئەوەی شتێك لە قورئان بەرای خۆی بڵێ و راستیش بكا ئەوە هەر هەڵەی كردوە) لە رێگای (جندب)ەوە وەك لە الفتح الكبير (٣/٢١٩) دایە.

کتێبێك یان دوو کتێب وەدەست بهێنرێ، بەڵکو دیراسەیەکی مەنهەجی و کارامەی دەوێ، کلیلی ئەو زانستانەی بداتە دەستی کە ڕێگەکانی چوونە نێو گۆڕەپانی فیکر و زانستی ئیسلامی بۆ هەموار بکا، تاکو ئەو دیراسەیەش بەرهەمی بدا دەبێ پشت بە لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل ببەستێ کە مامۆستای کارامە و ئاراستە کاری چاك و ڕەخنەگری بینا بەڕێوەی ببا، لە سێبەری تەقوا و بە نیازی پاداشتی خودا.

٢. دەبێ وشیار بین کە ئەو شەریعەتە بۆ خۆشبەختی خەڵکان لە هەردوو مەنزڵگا دابەزیوە: دونیا و دواڕۆژ، وە بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان کە دەگەڵ دەسەڵاتی عەقڵیان بگونجێ کە خودای بەرز بە بەندەکانی خۆی بە خشیوە و ڕێزداری سەرهەموو مەخلوقاتەکانی کردوون. شەریعەتی پاك هیچ کارێك داوا ناکا کە خەڵکان نەتوانن پێی هەلسن، بۆ ئەوە خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ الحج: ٧٨ خودای بەرز لەسەر بەندەکانی ئاسان کردوە، تاکو لە سێبەری خۆشەویستی کار بەو دینە بکەن نەك بە تۆبزی و بەزۆری. خودای دەسەڵاتدار لەو بارەوە دەفەرموێ ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ البقرة: ١٨٥ و ﴿يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ . . .﴾ النساء: ٢٨ دەیەوێ لەسەرتان سوك بکا چونکە زانایە بە بێهێزیتان ﴿وَخُلِقَ الْإِنْسَانُ ضَعِيفًا﴾ النساء: ٢٨ .

هەمو حوکمەکانی شەرعی بەرژەوەندی بەندەیان تێدایە و ڕشتن لەسەر دەستەبەرکردنی قازانج بۆیان، هیچ شتی تێدانی‌یە سودی بۆ خودا بگەڕێتەوە، چونکە خودای بەرز دەوڵەمەند و سوپاسکراوە. هەر لەبەر ئەوە دەبێ جزئیاتی

شەریعەت لە ژێر تیشکی ئەو کولیاتە تێبگەین و هەروەها، ئەوەی زانستی بە کولیاتی شەریعەت نەبێ و مەبەستەکانی تێنەگا و بنچینەکانی نەزانێ ئەوە ناتوانێ (فەرع) بۆ (اصل)و (جزئیات) بۆ (کلیات) بگێڕێتەوە. پێشەوا ئیبن بورهان[164] دەڵێ: (شەریعەتەکان سیاسەتن خودا بەندەکانی خۆی پێ بەڕێوەدەبات، خەڵکانیش لەوەدا جیاوازن بەپێی جیاوازی سەردەمان، بۆ هەر سەردەمێ جۆرێ بەڕێوەبردن هەیە و بەشێك لە لوتف و بەرژەوەندی پێیەوە تایبەتە بەو سەردەمە، هەروەك بۆ هەر ئوممەتێك جۆرێك لە بەڕێوەبردن دەیانسازێنێ، ئەگەرچی ئەوە دەرهەق غەیری خۆیان نەشیاویش بێ).[165]

زانایانی ئوممەت لەوەدا یەك دەنگن كە حوكمەكانی شەرعی -هەموی- هۆبەندن بە بەرژەوەندی بەندەكان و لەو پێناوەشدا دانراون، چ ئەوانەی بەهۆی دەقێك یا ئاماژەیەك خودا بۆ زانینی رێنوێنی كردوین، چ ئەوانەی بۆی رێنوێنی نەكراوین لەبەر حیكمەتێك كە خودای بەرز خۆی دەیزانێ. هەر بۆیە زۆر لە حوكمەكانی ئیجتهادی بە گۆڕانی سەردەم دەگۆڕێن، یان بە جیاوازی كەسەكان و هێز و توانا و بارودۆخیان جیاواز دەبن.

هەروەها پێویستە بزانین كە دەقەكانی قورئان و سوننەت، تێیان دایە لە ئیسپاتدا قەتعیە، وەك قورئانی پیرۆز و سوننەتی متەواتر، ... یان لە سوننەتدا هەیە لە ئیسپاتدا ظنیيە، وەك: گێڕانەوەی تاكە كەسی (اخبار

---

١٦٤ ابن برهان: احمد بن علي بن برهان البغدادي. وەفاتی ساڵی (٥١٨ ك) ئوصولیەكی ناسراوە كۆمەڵێك نوسینی اصولی هەیە: الوصول الى علم الاصول، والاوسط والوجيز. حەنبەلی بوە پاشان بۆتە شافیعی. سەرگوزشتەی لە: الطبقات الشافعية لابن السبكي (٤٢/٤) والوفيات (١٩٩/١) والبداية والنهاية (١٩٦/١٢) وطبقات الاشنودي (٢٠٨/١) والمنتظم لابن الجوزي (٢٥٠/٩) كە لێرەدا بە ابن تركان ناوی دێنێ.

١٦٥ كتاب الوصول الى علم الاصول، المسألة الرابعة في مسائل النسخ (مخطوط).

الآحاد). و دەلالەتی دەق وا دەبی ظنی‌یە یان وا دەبی قەتعیە. شارەزایی لە هەموو ئەوانە کاریگەری لە هەڵێنجان و ئیجتهاد و تێگەیشتنی دەق هەیە. بۆ کەس نی‌یە نکوڵی کەسانی‌تر بکا چونکە تێگەیشتنیان لە دەقێك ناکوکە دەگەڵ تێگەیشتنی خۆی. مادام وتەکە هەڵیدەگری و بەڵگەش بوی دەگونجی و دەقە شەرعیەکانی تریش دژی نین یان بەری ناگرن. زورترین حوکمەکانی پەیوەستدار بە هەرعەکان و تایبەت بە لایەنی کردەیی لەو جورەن کە بە ریگەی ظنی ئیسپات دەبن، ئەوەش رەحمەتی خودایە بو بەندەکانی تابوارێ ئیجتهاد تییاندا بۆ خەڵکان فراوانتربێ. مادام یاسادانەری لیزان دەرگەی ئاسانی بو بەندەکانی کردوتەوەو بەرژەوەندی خەڵکی بە گرنگ گرتوە. بۆ کەس ناشێ تومەتی کوفر یان فسق یان بیدعە بداتە پاڵ کەسی تر کە لە کاریك لەو کارانەدا موخالیفیەتی، بەڵکو لەسەریەتی عوزر بداتە موخالیفەکەی تا هەودای خوشەویستی لە نیوانیان بەردەوام بی و شایانی خوشەویستی و ریزی بی و خاتری برایەتی و خوشەویستی‌یەکەی بگری.

٢. بیگومان گرنگترین ئەرك ئەوەیە هەمو لا بزانین کە برایەتی ئیسلامی و یەکریزی موسولمانانی دلسوز و پاراستنی و وەلانانی هەرشتی کە زیانی لیدەدا و بناغەی بی هیز دەکا، گرنگترین و مەترسیدارترین ئەرکە و بەرزترین پەرستنە و چاکترین نزیك بونەوەیە لە خودا. چونکە بەو برایەتییە هیزی زاڵبون بەسەر هەموو کوسپەکانمان دەبی کە پیشگرن لە گێرانەوەی ژیانی ئیسلامی بەو شیوەی خودا و پیغەمبەر ﷺ پی‌ی رازین. بەسە کە پیغەمبەر ﷺ لە پەرتەوازەیی وشیارمان دەکاتەوە، ئەگەر ئەو کەسەی لە کومەل جیا دەبیتەوە بکوژری خوینی بە هەدەر دەروا. لەبەر ئەوە کەمتەرخەمی لە برایەتی ئیسلامی یان بەکەم گرتنی هەر تەنیا لەبەر راجیایی کاریکە نابی موسولمان بیکا و

بکەویتە دواوەیەوە. بەتایبەتی لەو بارودۆخەی دا کە ئومەتان بەسەرمان وەربونە. دەیانەوێ پشکۆی باوەڕ بکوژیننەوە کە خەریکە لە دڵەکان بگەشێتەوەو تووی چاکی بفەوتێنن، کە خەریکە لە خاك سەر دەردێنی، سەرباری دەستە ناپاکەکان کە هێرشدەکەنە سەری و هەوڵی لەباربردنی دەدەن.

بێگومان برایەتی لە پێناو خودا و یەکێتی دڵەکانی نێوان موسوڵمانان پلەی سەرەتایی ئەرکەکان دەگرێ. بەڵکو لە پێشەوەیانە. چونکە برایەتی هێز و پشتیوانی یەکتاپەرستی‌یە، هەروەها لێرەدا پلەکانی ئەهی لیکراویش هەنە، لە پێشەوەیانەوە لەباربردنی برایەتیە. هەر بۆیە زانایانی پێشین زۆر جار کاری چاکیان کردوە و چاکتریان واز لێ هێناوە، لەبەر خاتری هۆگربوون و دەرچون لە ناکۆکی،وابووە شتێ پێیان سوننەت بووە نەیان کردوە. بەڵام هەر بۆ ئەو مەبەستە شتی جائز (ڕەوایان) کردوە.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە فەرمویە: (موسوڵمانان ڕێکن لەسەر دروستی نوێژکردن لە دوای یەکتر. هەروەك هاوەڵان و تابعی و لەدوای ئەوان چوار ئیمامەکە هەندێك لە دوای هەندێکی‌تر نوێژی دەکرد. ئەوەی نکوڵی لەوە بکا ئەوە داهێنەری گومڕایە موخالیفی قورئان و سوننەت و کۆڕای موسوڵمانانە. وا بووە هاوەڵان و تابعی‌یەکان و دوای ئەوانیش (بسم الله)ی خوێندوتەوە، هەبووە نەیخوێندوتەوە. دەگەڵ ئەوەشدا نوێژیان لە دوای یەکتر کردوە، وینەی ئەبو حەنیفە و هاوڕێکانی و شافیعی و غەیری وان نوێژیان لە دوای پێشەواکانی مالیکی لە مەدینە کردوە، ئەگەرچی نە بە ئاشکرا و نە بەنهێنی (بسم الله) ناخوێننەوە. ئەبو یوسف نوێژی لە دوای ئەلرەشید کردوە لە کاتێکدا کەڵەشاخی گرتوە، مالیك فەتوای بۆ داوە کە پێویست بە دەستنوێژ گرتنەوە ناکا، ئەبو یوسف نوێژی لە دوا کردوە و دوبارەی نەکردوتەوە...

پێشەوا ئەحمەد لە کەلەشاخ گرتن و خوێن پژان دا رای بە دەستنوێژ گرتنەوە بوو لێیان پرسی: (ئەگەر ئیمام خوێنی لەبەر رۆیشت و دەستنوێژی نەگرتەوە. نوێژی لەدوا بکەم؟ فەرموی: چون نوێژ نە دوای سەعیدی کوڕی موسەییەب و مالیك ناکەی؟).[١٦٦]

ئەگەر رشت بوین لەسەر برایەتی ئیسلامی و یەکریزی موسولمانان، با بە میشکی کەس دانەیەت ئەوە مانای ناسانگیرییە لە بنەرەتی مەسەلە عەقیدەییەکان کە لە نێو بازنەی ریسا نەگۆرەکانی عەقیدە هیچ تەئویل هەلناگرن. چونکە رشت بوون لەسەر روبەروبونەوەی دوژمنانی ئوممەت پالمان پێوە نانێ بۆ ئەوەی بە بەلگەی رشت بوون لەسەر برایەتی دەست بدەینە دەستی کەسانی کە بەشیان لە ئیسلام دا نییە تەنیا ناو نەبێ. کێشە خیلافیەکانی کە نابێ لیکمان جیاکاتەوە هەر ئەوانەن کەزانا بەرێزەکانی پێشین دانیان پێداناوە و لە میانەی ئادابێکی چاك مامەلەیان دەگەل کردوە و بەلگەشیان لا هەبووە کە زیاتر لە رویەك بەرەوا دابنێ.

٤. هەروەك شتێکی زانراوە خودای بەرز ئەرکی پەرستشی بۆ خەلکان داناوە لە زور کاروباردا لە چاکترینەوە بۆ ئیختیار و بۆ جائیز پلە ریژی کردوە. ئەگەرچی هەمو پلەکانی پێشوتر لە گوشەی رەزامەندی خودا پێك دەگەنەوە، بەلام لە پایەدا جیاوازن. زور لە فەرز و واجبەکان شێوەی جورا و جوریان هەیە. دەکەونە نێو چێوەی هەرسی پلەی چاکترین و ئیختیار و جائیز. لە وانەیە پەرستن بە چاکترین شێوەی شەرعی ئەنجام بدرێ، بە چاکترین پاداشت وەردەگیرێ، وەك ئەوەی نوێژ لەسەرەتای کات بەجەماعەت دەکا و هەموو نوێژە سوننەتەکانیش ئەنجام دەدا، ئیختیاریش هەیە ئەوەش ئەنجامدانی تەنیا

١٦٦ الفواكه العديدة للشيخ المنقور (١٨١/٢).

واجبەکەیە بێ پلەی چاکترین، وەك نوێژکردن لە کاتی خۆی بەڵام لە سەرەتای کاتیش نا. بەڵکو لە کاتێك خۆی هەڵیدەبژێرێ. پاشان پلەی سێیەم: پلەی جائزی، ئەوەش پلەیەکە ئەگەر بەندە لەوە کەمتر بۆ خوی قبول بکا دەچێتە ریزی کەمتەرخەمان. لە ئەسەردا هاتوە (حسنات الابرار سیئات المقربین) ئەوەی چاوەنۆری لە هەمو خەڵکی بێ سەرباری جیاوازی حاڵ و باریان بەرزترین وێنەی ئیسلام بنوێنن. ئەوە شتێکی گەرەکە پێگەیشتنی ئاسان نییە. ئەگەر جیاوازی پلەی پەرستن و گوێڕایەڵی نەبوایە ئەوە پایەی بڕواداران لە بەهەشت لێك جیا نەدەبوو. توانای خەڵکان جیاوازە و هێزیان لێك جیایە و هەر کەس بۆ ئەوە گونجاوە کە بۆی خوڵقوێنراوە.

ئیبن جرير الطبري لە تەفسیرەکەیدا[167] هێناویەتی: کۆمەڵە خەڵکی لە مصر بە عەبدوڵڵای کوری عومەر گەیشتن. گوتیان: کۆمەڵێ شت لە قورئان دا دەبینین فەرمان دراوە کاریان پێبکرێ، کەچی کاریان پێناکرێ، دەمانەوێ بۆ ئەوە بچینە لای میری باوڕداران. دەگەڵی وەرێ کەوتن. بە عومەر ﷺ گەیشتن. عومەر بە عەبدوڵڵای گوت. کەی هاتی؟ گوتی: فلان کات... گوتی: بە ئیجازە هاتی؟ حەسەن (گێرەوەی فەرمودە) دەڵێ: (نازانم چۆنی وەلام دایەوە) جا گوتی: ئەی میری باوڕداران کۆمەڵێ خەڵکان لە مصر هاتنە لام گوتیان: ئێمە کۆمەڵێ شت لە قورئان دا دەبینین فەرمان دراوە کاریان پێبکرێ، کەچی کاریان پێناکرێ، حەزیان کرد بوئەوە بێنە لات. عومەر فەرموی کۆیان کەرەوە، دەڵێ: کۆمکردنەوە، روی کردە لە پێشترین پیاویان فەرموی: بە خودا سوێندت دەدەم و بە هەقی ئیسلام لەسەرت. قورئانت هەموی خوێندوتەوە؟ گوتی بەڵێ: ئایا لە دەرون دا رەفتارت بە هەموی کردوە؟ گوتی بۆ خودا

[167] تفسير الطبري (٥/٢٩).

دەڵێم: نا (ئەگەر گوتبای بەڵێ بەگژی‌دا دەچو) فەرموی: ئایا لە چاوت دا؟ ئایا لە زمانت دا؟ لە هەڵسوکەوتت دا رەفتارت بە هەموی کردوە؟ پاشان پێدا هات تا گەیشتە دواترینیان، جا فەرموی عومەر دایکی روڵە رۆی بۆ بکا تەکلیفی لێدەکەن خەڵك لە بەرامبەر قورئان راگری؟ پەروەردگارمان زانیویەتی گوناهمان دەبێت. ئەوجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا﴾ النساء: ٣١

پاشان فەرموی: خەڵکی مەدینە زانیویەتی؟ یان فەرموی: کەس زانیویەتی بوچی هاتونە؟ گوتیان: نا. فەرموی: گەر دەیانزانی بە ئێوە ئاموژگاریم دەکردن، واتە: وای دەکرد بینە پەند و ئاموژگاری بو غەیری خویان.

لەو روداوە وانەیەکی بەرز هەیە، پێشەوا عومەر ئەوەی تێدا رون دەکاتەوە، کە ئەو وێنە بەرزەی قورئانی پیروز بو موسوڵمانان کێشاویەتی، وێنەیەکی نمونەیی‌یە. پێویستە موسوڵمان هەوڵی وەدی هێنانی بدا، بەلام کاتی کەمتەرخەمی تێدا کرد، دەبی بزانی کە رەحمەتی خودا فراوانە. هەر کاتی لە تاوانە گەورەکان دورکەوتەوە ئەوا انشاءا لله موسوڵمان لەسەر خێرەکی گەورەیە، بەلام پێویستە بەردەوام تەماحی بو وێنە بەرزەکە هەبێ و هەر زیرو بە پەسەند نەزانی و لە سنوری دا بمێنێتەوە.

٥. ئەوەی لە کاتی ئێستادا یارمەتی کەمکردنەوەی هویەکانی ئیختیلاف و خوراژاندنەوە بە ئادابەکەی دەدا: زانینی هویەکانی ئیختیلافی زانایانی پێشینن (رضوان الله علیهم)و تێگەیشتنی ئەو هۆیانە و ئاستی بابەتیانەیان. تاکو ئەوە مایەی دەست گرتن بە (ئەدەبی ئیختیلاف) بێت.

ئەوان کاتی ئیختیلافیان دەبوو، ئەوا ئیختیلافیان هوگەلی بابەتیانەی دەبوو. هەموشیان موجتەهید بوون. هەر یەکێك لەوان داواکاری هەق بوو، وەك بە

دوای ون بوویدا بگەڕێ. جا لای یەکسان بوو ئەو ون بووە، لەسەر دەستی خۆی یان یەکێکیتر بدۆزرێتەوە.

٦. ناسینی ئەو هەموو مەترسیانە و ئەو بەرمنگارییە ترسناکانە و ئەو پیلانە فێلاویانەی دوژمنانی ئیسلام کە ئامادەی دەکەن بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو پێشەنگە ئیمانداری ئاڵای ئەو بانگەوازەیان هەڵگرتووە، شتێکی چاکە کە موسوڵمانان ناچاری دەستگرتن بە ئادابی ئختیلاف بکا. لە حیسابی دەستە دوای دەستەی دوژمنان دا نییە، تا بویان بکرێ دەستبەرداری بن. گرنگ ئەوەیە زاڵ بن بەسەر کارکەرانی ئیسلام بە جیاوازی مەزهەب و جودایی بۆچوونەکانیانەوەش. ئەوەش وادەکا کە وروژاندنی هەر ئیختیلافێک لە نێو موسوڵمانان یان گەشەپێدانی هویەکانی یان بەزاندنی ئادابەکانی خیانەتێکی گەورە بێ بۆ ئامانجەکانی ئوممەت و تاوانێکی زل بێ دەرهەقی. ناتوانری پاساو یان بیانوی بۆ بهێنرێتەوە.

٧. لەبەرودوای ئەمەشەوە، رزگاری لە پابەند بوون بە تەقوای خودا بە ئاشکرا و نهێنی و رەزامەندی خودا لە حاڵەتی کوکی و ناکوکی دایە. دەگەڵ رشت بوون لەسەر تێگەیشتنی دینی خودا و دابڕان لە ئارەزوی نەفس و دورکەوتنەوە لە دەغدەغەی شەیتان و ناسینی رێگەکەی و خو دوور گرتن لە تەڵەوداوی. بەسە ئەوەندە گرفتارییەی توشی ئوممەت بووە. ئیستا کاتی ئەوە هاتووە بێتەوە سەر حۆ و بە قورئان رێگەی روونکاتەوە و دەست لە سوننەتی پێغەمبەرەکەی گیربکا. ئومێد وایە خودا رزگاری ئوممەت لەسەر دەستی ئەو وەچە چاکە بینێتە دی ئەگەر نیەتی دەگەڵ خودا راست بێ. ئەو رێگەیە بگرێ کە زامنی پیشرەوایەتی کەشتی بەرە و کەناری ئارامی دەکا. پاش ئەوەی شەوی نەهاتی و تاریکی درێژەی کێشا. پیاوچاکانیش لە دوعای راستی و سەرکەوتن بو ئەو

دەستە ئیماندارە رەزیلی نەکەن. داوا لە خودا دەکەین ئەوەمان فیرکا کە سودی هەیە، ئەوەش سودمان پی بدا کە فیرمان دەکا و زانستمان پتر کا، گوتەمان لەسەر هەق کوکاتەوە، راستی و ریرونیمان لە هەمو کاردا پی ببەخشی، لەشەری نەفس و کردەوەی خراپ بمان پاریزی، نەمانکاتە وینەی ئەو نافرەتەی ریسەکەی دەکردەوە خوری. هەر خودا خاوەنی ئەوەیە و توانایە بەسەری دا.

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

## پێرستی ئایەتەکان

(أ)



(ب)



(خ)

(ع)

﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ﴾ النباء: ١،٢

(ف)

﴿فَسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ النحل: ٤٣

﴿فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِنْ بَيْنِهِمْ...﴾ مريم: ٣٧

﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ الحشر: ٢

﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾ التوبة: ١١

﴿فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ﴾ البقرة: ١٣٧

﴿فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً﴾ النور: ٣٣

﴿فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا﴾ النساء: ١٣٥

﴿فَلَمْ يَكُ يَنْفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا﴾ غافر: ٨٥

(ق)

﴿...قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللهُ﴾ البقرة: ١٤٠

﴿قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللهَ بِدِينِكُمْ...﴾ الحجرات: ١٦

﴿قُلْ لَا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ قَدْ ضَلَلْتُ إِذاً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾ الانعام: ٥٦

﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ الاعراف: ٣٢

(ك)

﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ إِنْ يَقُولُونَ إِلَّا كَذِباً﴾ الكهف: ٥

(ل)

﴿لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ المائدة: ١٠١

﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ﴾ الحجر: ٨٨

﴿لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا﴾ البقرة: ٣٢

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ الحديد: ٢٥

(م)

﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ . . .﴾ الانعام: ٣٨

(هـ)

﴿هذا إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَى . . .﴾ طه: ٨٨

(و)

﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ . . .﴾ البقرة: ٢٨٢

﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ الانفال:٤٦

﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾ التوبة: ٦

﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا﴾ النساء: ٣٥

﴿وَإِنَّ كَثِيراً لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ الانعام: ١١٩

﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً﴾ المائدة: ٦

﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْراً﴾ الاحقاف: ١٥

﴿وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفاً﴾ النساء: ٢٨

﴿وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ﴾ الأنعام: ١٢٠

﴿وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ، أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ، وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾ الرحمن: ٧-٩

﴿ وَعَلَامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴾ النحل: ١٦

﴿ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً ﴾ البقرة: ١٤٣

﴿ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللهِ ﴾ ص: ٢٦

﴿ وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ النساء: ٢٩

﴿ ولا تكونوا من المُشركين، من الَّذين فرقوا دينهم وكانوا شيعاً، كُلُّ حِزبٍ بما لديهم فرحون﴾ الروم: ٣١،٣٢

﴿ ولا تنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم ﴾ الانفال: ٤٦

﴿ ولو شاءَ ربُّكَ لجعلَ الناس أُمةً واحدةً ولا يزالونَ مُختلفين ﴾ هود: ١١٨

﴿ ولا يُضارَّ كاتبٌ ولا شهيدٌ ﴾ البقرة: ٢٨٢

﴿ . . . ولكنِ اختلفوا فمنهم مَنْ آمنَ، ومنهم مَنْ كفرَ. . . ﴾ البقرة: ٢٥٣

﴿ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ ﴾ المؤمنون: ٧١

﴿ ولو شاءَ ربُّكَ لجعلَ الناس أُمةً واحدةً ولا يزالونَ مُختلفين ﴾ هود: ١١٨

﴿ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْياً بَيْنَهُمْ ﴾ آل عمران: ١٩

﴿ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ يونس: ١٠١

﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴾ الحج: ٧٨

﴿ وَمَا كَانَ اللهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ، وَمَا كَانَ اللهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ الأنفال: ٣٣.

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللهُ الشَّاكِرِينَ ﴾ آل عمران: ١٤٤

﴿ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللهُ، وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ ﴾ آل عمران: ٧

﴿ وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ ﴾ البقرة: ٢٢٨

﴿ ومن لم يجعل الله له نورا فما له من نور ﴾ النور: ٤٠

﴿ وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيراً ﴾ النساء: ١١٥

﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَاناً عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ ﴾ الحجر: ٤٧

﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ﴾ البقرة: ٢٣٣

(ي)

﴿ يَبْنَؤُمَّ لاَ تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلاَ بِرَأْسِي إِنِّي خَشِيتُ أَنْ تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي ﴾ طه: ٩٤

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ . . ﴾ الحجرات: ٢

﴿ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاساً يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشاً ﴾ الاعراف: ٢٦

﴿ يُرِيدُ اللهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ . . . ﴾ النساء: ٢٨

﴿ يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾ البقرة: ١٨٥

## پێرستی فەرموودەکان

(أفلا شققت عن قلبه حتى تعلم من أجل ذلك...)

(أقال: لا اله الا الله وقتلته؟!)

(اقرؤوا القرآن ما ائتلفت عليه قلوبكم...)

(اللهم فقهه في الدين وعلمه التأويل)

(امرت ان اقاتل الناس حتى يقولوا: لا اله الا الله...)

(انما هلك من كان قبلكم باختلافهم في الكتاب)

(انما هلكت بنو اسرائيل بكثرة سؤالهم...)

(قتلوه قتلهم الله ألا سألوا اذا لم يعلموا...)

(كلكما محسن)

(لاتختلفوا فان من قبلكم اختلفوا فهلكوا)

(لا تختلفوا فتختلف قلوبكم)

(لايبولن احدكم في الماء الدائم، ثم يغتسل فيه)

(لايصلين احد العصر الا في بني قريظة)

(من قال في القرآن برأيه فاصاب فقد اخطأ)

(من قال في القرآن بغير علم فليتبوأ مقعده من النار)

(يا عمروا صليت بأصحابك وانت جنب؟)

# ناوەڕۆك

## ئەم كتێبە

بەشداریەكی لێبڕاوانەیە بۆ دەستەبەركردنی وشیاری لەمەڕ دۆزەكانی گۆڕەپانی ئیسلامی و هەوڵێكی راستگۆیانەیە بۆ پڕكردنەوەی درزو كاركردن لەسەر چارەكردنی ریشەی قەیرانی فیكری ئوممەتی ئیسلامیمان و بوژاندنەوەی رەهەندی ئیمانی لە دەروونداٰ ، ورەوشتێك وەبیر موسڵمانان بخرێتەوە كە ماوەیەكی درێژی بەسەردا تێپەڕبووەو دڵەكانی لێ بێ بەش بوون و كاریگەری لەسەر دەروونەكان لاواز بووە، بیر خەرەوەیەكە بۆ موسڵمانان كە ئیختیلافی گێژانەو ئارەزووی زاڵی پەیڕەوكراو، دوو نەخۆشی ترسناكن دەبێ بەرگری و دژایەتیان بكرێ و شوێنەواریان نەهێڵدرێ ئەوەش مەرجی یەكەمە بۆ چارەسەری قەیرانی فكری ئوممەت و چارەسازی رێچكەكانی و دووبارەرێكخستنەوەی سەرەتاكانی.

لەهەمان كاتدا ئەم كتێبە هەوڵێكە لەسەر ئاستێكی باڵا بۆ بیرخستنەوەی موسڵمانی سەردەم بەوەی كە پێشینەكان لەسەری بوون لە بەرنامەی دروست و پابەندی تەواوو رێسای پتەو بۆ كردارە ئیجتیهادی یەكان و هەڵێنجان و كۆنترۆڵی بیروڕاو هێنانەوەی هۆشی موسڵمانە كە ئەركی سەرەكی یەتی هەست بە رۆڵی ژیاری و گشتیاتی ئیسلام و مەبەست و مەرامی شەرعی خۆی بكاو لە میانەی هەموو ئەوانەوە سەیری بەشەكان و لایەنەكان و كێشە سنوردارەان بكا .

دەخوازم ئەم كتێبەو وێنەی ئەو بەشدار بێ لەدەستەبەركردنی بەشێك لەو مەبەستانەو رێگە خۆشكا بۆ پەروەردەكردن لەسەر ئەو ئادابانە. لە خودا دەخوازین ئەوە بێنێتەدی و هەر ئەویش پشتیوان و توانایە بەسەری دا .